مێژووی جەنگی جیهانی دووەم

زنجیرەی سەرکردە سەربازییەکانی ئەڵمانیا







# مارشاڵ

# هیرمان ویلهلم گۆرنگ

جیڤارا کمال

ن : کۆمەڵێک لێکۆڵەری سەربازی

# مارشاڵ
# هێرمان وێلهێلم گۆرنگ

نوسینی : کۆمەڵێک لێکۆڵەری سەربازی
وەرگێڕانی : جیڤارا کەمال

بەشی یەکەم:

# دروستبونی ژیانی مارشاڵ گۆرنگ و هەستکردنی بە لێپرسینەوە

هرمان گۆرنگ لە ( 2 ) ینایری ساڵی ( 1893 ) دا لە دایکبووە لە دوای ( 9 ) هەفتە پاش لەدایکبوونی ، دایکی لای چەند کەسێك لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی دەروونناسی باشووری ( باڤاریا ) ی ئەلمانیا جیی دەهیلیت کە ئەرکی بەخێوکردنی دەگرنە ئەستۆ مەبەست لەم جی هیشتنەش ئەوە بوو کە دایکی دەیویست بگاتە هاوسەرەکەی واتە باوکی گۆرنگ کە ( قونسول ) ی ئەلمانیا بوو لە دورگەی هاییتی لە دەریای کاریبی . شایانی باسەکە ( هیزیش ئارنست گۆرنگ ) لەوەو پیش ئەفسەری ( هیزی سوارە / سلاح الفرسان ) بوو لە پاشان ئەرکی ( قونسول ) ی گرتە ئەستۆ پاش ئەوەی لە سوپا دورکەوتەوە ، ( هیزیش ) بۆ جاری دووەم ژنی هینابوو کاتیك کە لە ( لەندەن ) وانەکانی کارگیری هەریمە داگیرکراوەکانی دەخویند لە ( 45 ) ساڵیدا . بەڵام ژنەکەی کە ناوی ( فرانزیکا ) بوو بە رەچەڵەك ( بافاری ) بوو لە دەرەوەی ئەلمانیادا دەژیا لە باشووری رۆژئاوای ( ئەفریقا ) دا کە لە ژیر دەسەڵاتی ئەلمانیادا بوو و خاوەنی ( 5 ) منال بوو لە ( هیزیش ) و ئەو منالەی کە لە (باڤاریا ) هاتە دنیاوە ناونرا ( هرمان ویلهێلم گۆرنگ ) بەم جۆرە ئەم قونسولە ئەلمانییە بووە خاوەنی ( 9 ) منال . کە ( 5 ) یان لە ژنی یەکەمن ئەو کاتە هیشتا خیزانی گەورە ڕێپێدراو بوو ( هیزیش گۆرنگ ) وردە وردە لە خانەنشینی نزیك بوەوە لیرەدا بە یەکجاری دوری نیوان خۆی و خیزانەی نزیك بوەوە و خیزانیکی گەورە پیکەوە نرا ئەم خیزانە بژیویەکی ئەوتۆیان نەبوو چونکە زۆربون ، بەهەرحال لە یەکیك لە گەڕەکەکانی ئەلمانیادا هەر چۆنیك بیت ژیانی ئاسایی خۆیان لە یەکیك لە ناوچەکانی بەرلیندا دەبردە سەر .

هەر لە منالیەوە ( گۆرنگ ) چاوکراوە و وریا بوو زۆر سەربەستانە هەلسوکەوتی دەکرد ، باوکی لە تەمەنی ( 5 ) ساڵیدا رۆژیك نیشانیکی ئەسپ سواری خۆیی پیشکەش کرد کە زۆر دلخۆش بوو پێی بەو پێیەی کە باوکی کاتی خۆی ئەفسەر بووە زۆر لە ئەفسەرانی هاوریی کە هیشتا لە کاردا بوون سەردانیان دەکرد بۆ مالەوە ، شایانی باسە کە گۆرنگ هەمیشە لە چاودیری

کردنـی ئەو ئەفسـەرانەدا بـوو بە وردی سـەرنجی جل و بەرگ و هەلسوکەوتی دەدان و هیوای دەخواست کە ئەویش ببیتە یەکیك لەو ئەفسەرانە.

لە ڕێـگەی دایکیـیەوە ئەم خیـزانە هاورییەکیـان هەبـوو کە نـاوی (هومـان ئاینیش) بوو و زۆر جار لە کاتی مندال بوندا مامانی ( فرانزیکا ) بوو بەو پێیەی پزیشکی پسپۆر بوو لەم بوارەدا و ( فرانزیکا ) ش دۆستایەتیەکی پتەوی لەگەلدا پەیداکردبوو و ئەو خانوەی کە لە بەرلین خیزانەکەی گۆرنـگ ی تیادا دەژیا مولکی ئەم پزیشکە بوو بەبآ بەرامبەر ئەو خیزانەی تیادا جیگیر کردبوو پاش ئەوەی ئەم پزیشـکە لە دەرەوە گەڕایەوە بـۆ ئەلمانیـا و پـارە و پـولیکی زۆر و نازنـاویکی باشـی بەدەسـت هینـا بـوو هەسـتا بە گرتنـی قەلایەك لە نزیـك ( موترنـدورف ) لەسـەر سنوری ( باڤاریـا / نەمسـا ) ، بەڵام قەلای یەکەم کە هەر ئەم پزیشـکە خـاوەنی بـوو دەکەوتە (فالدنیشـتین ) لە دوری ( 15 ) میـل لە ( نـورمبرگ ) ەوە و لە سـەر پاشـماوەی دیـواریکی میژوویـی سـەدەی ( 11 ) بنیـادنرابوو ئەم پزیشـکە تەرخـانی کردبـوو بۆ خیـزانەکەی ( گۆرنـگ ) و داوای لیکردن لەوێ نیشتەجێ ببن ، لە پاشاندا ئەم خیزانە بە دایك و بـاوکەوە کە بریتـی بـوون لە ( ئەلبـرت کوری گەورە و دوو کچ بە نـاوی ئولـها و پـاوڵا ئنجـا هرمـان گۆرنـگ ) چـوونە ئەو کۆشـکە و لەم کـاتەدا ( گۆرنـگ ) تەمەنـی ( 8 ) سـاڵان بوو بەم گۆرانکاریە زۆر دلخۆش بـوو کە لە خـانویەکی وا فراوانـدا ژیـان بەسـەر دەبـات و ئەو کۆشـکەش لە هەر چـوارلاوە دیمەنـی سروشـتی جـوان ئەمڵاولایـان رازانـدبوەوە ، ئەو رۆژانە خەریکـی یـاری کـردن و هەلـگەران بـوو بەسـەر چیاکاندا و لەم بوارەدا چالاکی خۆی پیشان دابوو.

هـاورییەتی پزیشـك ( ئاینشـتن ) مـاوەی ( 15 ) سـاڵی خایانـد وەك ئەنـدامیکی ئەو خیزانەی لیهاتبوو هەرچەندە بە هۆی پیشـەکەیەوە زۆرجـار دووردەکەوتـەوە ، ئاینشتن گۆرنگی لە قوتابخانەیەکی ناوخۆیی داناو گۆرنـگیش زۆری پیخـۆش بـوو و خـۆی دابـوە خویـندنەوەی میـژوژ و زۆر حەزی بە بـاس و خویـندنەوە دەکـرد لەسەر نازناو و ئازایەتی بابەتیك لە میژووی ئەوکاتە کە بریتـی بـوو لە ( ئەسـپ سـوارانی تیوتـون و فریـدریکی گەورە ) بە تـایبەت پـاش ئەوەی زانـی کە کـاتی خـۆی بـاپیرە گەورەی بەریـوەبەری ئـابوری فریـدریك بـووە ، ئەم باسـە لە بیـری گۆرنـگدا وەك شـتیکی پیرۆز مابوەوە تاوەکو ئەو کـاتەش کە بەڕیوەبردنی پرۆژە چوار ساڵیەکەی هتلر

دەگـریتە ئەسـتۆ لە تەمەنـی ( 12 ) سـاڵیدا ( هرمـان گۆرنـگ ) دەنیـردریتە ( ئەکـادمی سـەربازی ) لە ( کارلسـروو ) لە پـاش کۆتـایی هینـانی خوینـدن و لە تەمەنی ( 16 ) ساڵیدا پەیوەندی دەکات بە ( کۆلیژی سەربازی ) لە ( لیشترفیلد ) کە لە بەرلینەوە نزیك بوو ، شایانی باسە کە ئەم حالەتە تەواو لەگەل حەزوو ئارەزووەکانی گۆرنگدا دەگونجا لەم ماوەیەدا بەهۆی ناکۆکیەکی نیوانی (ئاینشتن ) و دایکی کۆشکەکە جی دەهیلین و لە شاری ( میونخ ) جیگیردەبن لە ساڵی ( 1913 ) دا و پیش هەلگیرساندنی جەنگی جیهانی یەکەم بە ساڵیك گۆرنگ باوکی دەمریت و گۆرنگیش زۆر بە کول و پەژارەیەکی زۆرەوە لەسەر گۆرەکەی بە جل و بەرگی سەربازییەوە دەگری لە پاشان ئەرکی ئەو خیزانە و بژیویان دەکەویتە سەر (ملازم هرمان گۆرنگ).

گۆرنگ بە ئازایەتی نازناوی وەرگرت بە تایبەتی پاش ئەوەی کە پاش شارۆچکەی ( ئالالای ) هەستا بە گرتنی شارۆچکەی ( ملهوزی ) لە هەریمی ( ئالزاس ) بە هاوکاری تیپیك سەرباز.

* * *

# گۆرنگ و بواری فڕۆکەوانی

پاش ئەوەی کە هاورییەکی بە ناوی ( ملازم بروتو لورزر ) پەیوەندی بە قوتابخانەی مەشقی فرۆکەوانی دەکات گۆرنگ هەوڵدەدات لە هەمان قوتابخانە وەربگیریت بەڵام بە هۆی تووش بونی گۆرنگ بە نەخۆشی (رۆماتیزمە) کە لە ئەنجامی ژیرخانە گلەکانوە توشی هاتبوو بە ناچاری مۆلەتی نەخۆشی

وەردەگریت لە پاشان داواکاریەکەی سەبارەت بە وەرگرتنی لەو قوتابخانەیە رەت دەکریتەوە بەڵام گۆرنگ هەر سور بوو لەسەر بەشداری کردنی بە شیوەیەك کە بەرپرسان ناچاربوون بیدەنە دادگای سەربازی دادگاش بڕیاریدا بۆ ماوەی ( 3 ) هەفتە لەسەریەك گۆرنگ لە شەڕگەکاندا بمینیتەوە و دانەبەزیت وەك سزایەك ، پاش ئەوەی ماوەی دیاریکراو تەواو دەبیت بەهۆی ناوبانگ و حەزکردنی بە بەشداربوون لەم بەشە نوییەی چەکی ئەلمانیادا بڕیاردرا لەو قوتابخانەیە وەربگیریت لە پاش کۆتایی هاتنی مەشق گۆرنگ هەستا بە بەشداری کردن و هاوکاری کردنی هاوریکەی ( لورزر ) لە لیخۆڕینی یەك فرۆکەدا بە هاوبەشی ، واتە فرۆکەیەکی دوو شوفیری کە ( لورزر ) ئەرکی لیخوڕینی گرتبووە ئەستۆ و گۆرنگیش ئەرکی چاودیری پاش ئەوەی ئەم دوو ئەفسەرە رەوانەی جەنگەکان کران لورزر هەوڵیدەدا لە ئاستیکی زۆر نزمدا بەسەر شەڕگەکاندا بفریت بۆ ئەوەی گۆرنگی هاوریی بتوانیت وینەی روون و درشتی مۆلگە سەربازیەکان بگریت ، شایانی باسە زۆرجار بە دەمانچە تەقەی لە دوژمنان کردوە لە ئەنجامی فڕین بە شیوەیەکی یەکجار وا نزم و زۆرجاریش بە دەستی خۆی بۆمبی داوە بەسەریاندا . هیزی ئاسمانی ژمارە ( 25 ) ی سوپای ئەلمانی پرینس ( فریدریك ویلهلم ) سەرکردایەتی دەکرد زۆر بە زیرەکی و ئازایەتی ئەم دوو هاورییە ، و هەر ئەمەش وای کرد کە ئەم دوو ئەفسەرە لەلایەن جیگری سەرۆکی ئەلمانیاوە بانگهیشت بکرین و نیشانی ئازایەتی کە بە (خاچی جەنگی نمرە / 1 ) ناسراو بوو وەربگرن هەروەها ئەم دوو ئەفسەرە ریپیدران لەگەڵ گەورە سەرکردەکاندا گفتوگۆ لە بارەی شەڕگە و مۆلگە سەربازیەکانی دوژمن بکەن بە پاڵپشت بەو وینانەی لەلایەن خۆیانەوە گیراون بە خیراییەکی زۆر ناوبانگی ئەم دوو هاوری و ئەفسەرە بڵاوبۆوە .

لە ساڵی ( 1915 ) دا و لە مانگی ئەکتۆبەردا ( گۆرنگ ) بووە فرۆکەوان و شۆفیری فرۆکەیەکی ( دوو ئامیری / گیارە ژات محرکین ) کە پیویست بوو بەرگری و بەرهەلستی بۆمب هاویژە بریتانیەکانی پێ بکات لەجۆری ( هاندلی بیگ ) لە رۆژیکی زستانی ساڵی ( 1915 ) دا هەستا بە هیرش بردن بۆ سەر یەکیك لەم فرۆکە بەریتانیانە هەر خۆی بە تەنیا و بە هۆی دەمانچە دەستیەکەیەوە دەتوانیت یەکیك لە بۆمب هاویژەکانی ئەو فرۆکەیە لە کار بخات بەڵام پاش کەمیك چەند فرۆکەیەی بەریتانی دیکەی لە جۆری ( سوبویر ) لی

پەیدا دەبیت و فرۆکەکەی گۆرنگ دەدەنە بەردەستریژ و لە ئەنجامدا ( تانکی سوتەمنی / خزان الوقود ) کەی بەر دەکەویت و فرۆکەکە بەرەو زەوی دادەگەرێ و گۆرنگیش کەمیك لە هۆش خۆی دەچیت بەڵام لە پیش کۆتایی هاتن و بەرکەوتنی فرۆکەکەی بە زەوی گۆرنگ بە هۆش خۆی دیت و لە هەوڵیکی کەم ویننەدا توانی فرۆکەکەی بەرز بکاتەوە و ئاراستەکەی بەلای هیلە ئەلمانیەکاندا بگۆریت لە پاشاندا لە یەکیك لە گۆرستانەکانی ناو خاکی ئەلمانیا دەکەویتە خوارەوە و بەو هۆیەوە یەك ساڵی تەواو لە نەخۆشخانە دەکەویت لەم ماوەیەدا ناودارانی هیزی ئاسمانی لە ناوبانگ و ئازایەتیدا خەلکی باسی دەکردن و وینەی پاڵەوانە فرۆکەوانەکان لە بازاڕ و شوینە گشتیەکاندا دەفرۆشرا لەو وینانە وینەی ( ریشتهوفن ) و ( ئاودت ) .

شایانی باسە لەگەل هاتنی ساڵی ( 1917 ) دا وینەی گۆرنگیش بووە یەکیك لەو وینانە ، پاش ئەوەی کە لە نەخۆشخانە دەرچوو دەستبەجی پەیوەندی کردەوە بە پۆلەکەیەوە و لە مانگی مایۆدا گۆرنگ توانی سەرکردایەتی پۆلیك فرۆکە بکات و لە ساڵی ( 1918 ) دا بەنرخترین و بێ وێنەترین ( مەدالیا ) وەردەگریت کە بە نیشانیك دادەنرا ، دەدرا بەو سەرباز و فرۆکەوانەی توانیبیتی ( 25 ) فرۆکە لە فرۆکەکانی دوژمن بخاتە خوارەوە ، کە گۆرنگ وەریگرتووە .

لە مانگی ئەپریلی ساڵی ( 1918 ) دا یەکەمین و بە ناوبانگترین فرۆکەوانی ئەلمانی دەکوژریت کە ناوی ( ریشتهۆفن ) بوو لە پاشان سەرکردە ( رینهارت ) سەرکردایەتی پۆلە فرۆکەکەی ریشتهوفن دەکات پاش لەناوچونی ( ریشتهۆفن ) کە ئەویش لەکاتی تاقیکردنەوەی فرۆکەیەکی نوێ دەکوژریت ، لە پاشان سەرکردایەتی پۆلەکە دەدریتە دەست ( گۆرنگ ) و گۆچانەکەی ( ریشتهوفن ) و ( رینهارت ) وەردەگریت و دەبیتە پاڵەوانی مەیدان .

گۆرنگ لە زۆربەی ئەو راپۆرتانەی لەکاتی جەنگەکاندا دەینارد بۆ سەرکردایەتی باسی لە گرانی و بە زەحمەتی پەیوەندی کردنی فرۆکە ئەکرد لەگەل یەکتردا و پەیوەندی لە فرۆکەوە بۆ زەوی ، هەر ئەمەش وای کرد کە گۆرنگ داوا بکات گۆڕانکاری و ئامیری نوێ لەناو فرۆکەکاندا دابنریت بۆ ئاسانکردنی ئەرکی پەیوەندی کردن لەلایەکی ترەوە پیویست بوو لەسەر هەر

فرۆکەوانیـك کە رۆژانە ( 5 ) جـار هەلبسـیت و چـالاکی ئەنجـام بـدات ، ئەم کارەش بوو بوە هۆی مایەی ماندوبونیکی زۆری فرۆکەوانەکان و فرۆکەکانیش .

لەبەهاردا جەنگ کۆتـایی پـی دیت لەم کـاتەدا گۆرنـگ تەمەنـی ( 25 ) سـاڵ بوو بەو پێیەی کە گۆرنگ لە سـەرکردەکانی فەرمـانڕەوایی ئەلمانیا بـوو هەرگیز نەیـدەتوانی رەزامەنـد بیـت بە دارمـان و لەنـاوچوونی کتـوپڕی ئەلمانیـا لە سـالّی (1918 ) هەرچەنـــدە چەنـــد پروپاگەنـــدەیەکی بیســـتبوو لەوانە دەســـت لەکارکیشـانەوەی ( قەیسـەر ) لە دەسـەڵات و یـاخی بـوونی کەشتیەکی گەورەی جەنگ لە شیوەی ( ئستۆل ) لەگەل هەواڵی ئەگەری بەرپابوونی کودەتایەك لەنـاو سوپادا ، چونکە بەڕای سوپا حکومەتی ئەلمانیا لە ناوەوە تووشی لیدانی خنجەری ژەهـراوی هـاتووە ، ئەمـانەو هەوالـی ئەنجامـدانی کودەتـایەك لە روسـیای پـی ڕاگەیەنـرا ، بەڵام گۆرنـگ هەمـوو پیـاوانی فرۆکەوانـی کـۆکردەوە و پێـی ڕاگەیـاندن کە نابیت فرۆکەکانیـان بدەنە دەست فەرەنسیەکان وەك فەرمانیـان پـی دراوە ، بەڵام فرۆکەوانەکـان فرۆکەکانیـان بەرەو ئەو جیگـایە بـرد کە بڕیـار وابـوو بدریتە دەست فەرەنسیەکان شـایانی باسـە لەکـاتی نیشتنەوەی ئەو فرۆکـانە لەلایەن فرۆکەوانەکـانەوە تیـك شـکینران لە ئەنجـامی بەئەنقەسـت بە زەویدانیانـدا گۆرنگیش بە فـرۆکەکەیەوە لە فرۆکەخـانەی ( مانهـایم ) نیشـتەوە و هەڕەشـەی لە لیژنە کریکاری و سـەربازانی و شوعیەکان کـرد کە ئەگەر بیت و سـەرجەم ئەو چەکـانەی کە لە فرۆکەوانەکـانی هـاوڕیی سـەندراوە نەدریـتەوە دەسـتیان ئەوا بەو چەکەی کە لە سەر فرۆکەکەیەتی گوللە بارانـی هەمووان دەکات .

گۆرنـگ لەو رۆژەدا دوا راپـۆرتی خـۆی نووسـی کە بریتـی بـوو لە (ئەمـڕۆ نـوڤەمبەرە و ڕاوەسـتانی شـەڕ ڕاگەیەنـدراوە و پـۆلە فـرۆکەکەم لە بـارودۆخیکی ناخۆشی کەش و هەودا بەرەو ( دارمستادت ) کەوتۆتەڕێ . شـایانی باسـە کە لەو رۆژەوەی ئەو پـۆلە فـرۆکەیە دامەزرابـوو تـاوەکو ئەوکـاتەی شـەر راگیرابـوو ریـژەی ( 644 ) فـرۆکەی دوژمنیـان تیـك شـکاندبوو و زیـانی فرۆکەوانەکـانیش بریتـی بـووە لە ( 56 ) کـوژراو لەگەل (6 ) سـەرباز و برینـدارکردنی ( 52 ) ئەفسەر و دەرەجەدار و ( 7 ) سەرباز.

# ژن هێنانی گۆرنگ و کۆبونەوەی لەگەڵ هتلر پاش بێ هیوایی

گۆرنگ به پلەی ( کابتن ) له سوپا دورخرایەوە ( تسریح ) کرا و ئەم کارەش بووە هۆی به هەلم بوونی حەز و ئاواتەکانی .

پاشان شیوعیەکان داوایان له کریکاران و سەربازان کرد هەستن به ئەنجامدانی شۆڕش و ئەفسەرەکانیش له ترسی گیانی خۆیان نەیان دەویرا به جل و بەرگی سەربازیەوە به شەقامەکاندا هاتوچۆ بکەن ئەنجا (قەیسەر) وازی له حوکم هینا و کۆتایی بەو دەسەڵاتە هات و له پاشاندا حکومەتیکی کۆماری نوێ دامەزراو و راگرتنی شەڕی به رەسمی ئیمزا کرد ، ئەم کاره لەلایەن سوپاوە به خنجەری ژەهراوی له قەڵەم دەدرا چوونکه رەزامەندبوون به شەڕ وەستان واتای هاتنه پیشی پەیمان نامەی ( ڤێرسای ) و مەرجه ناڕەواکانی .

گۆرنگ و هاوڕیکانی بەبآ هیچ پاداشت و مووچەیەك له سوپادا (تسریح) کران بوبووه مایەی نیگەرانی و ئەو قەیرانەی وڵاتەکەیانی تیکەوتووه لەگەڵ مەترسی بەرپابوونی شۆرش وەك له روسیا ئەنجام درابوو .

لە پاشان گۆرنگ دەگەڕێتەوە شاری ( میونخ ) دەبینێت کە دایکی ژیانیکی مەژی و مەمرە دەژی ماوەیەك بێکار دەبیت لە پاشان کۆمپانیای ( فوکردولن ) داوای لی دەکات کە هەستیت بە تاقیکردنەوە و نمایشکردنی ئەو فرۆکە مەدەنیە نوییانەی کە ئەو کۆمپانیایە بەرهەمی هیناوە لە سەرشیوەی ( فوکر 47 f ) ە ، بەو مەرجەی کە فروکەیەك لەجیاتی کریٰ بەرێت بۆ خۆی پاش نمایشکردنی بۆ جەماوەر .

گۆرنگ هەستا بەئەنجامدانی کاری پیشاندانی فرۆکەکە لە شاری (کۆبنهاگن) لە وڵاتی ( دانیمارك ) و چەند کاریك بەهلەوانی بەو فرۆکەیە ئەنجامدا کە بووە هۆی رەزامەندی و دلخۆش بوونی جەماوەر بە تایبت پاش ئەوەی کە دەستی بە نەفەر هەلگرتن کرد لەگەل خۆی و هەر هاتن و چونیك بە بەرامبەر ( 50 ) کراون کە جۆریك بووە لە پارە . بەم هۆیەوە ناوی بڵاوکرایەوە و باسی ژیانی پیشووی کە یەکیك بووە لە ئەفسەرە فرۆکەوانە جەنگییە بآ وینەکانی ئەلمانیا ، ئەنجامەکەی بوە خۆشی ژیان بەسەر بردن .

پاش ماوەیەك کۆمپانیایەکی فرۆکەوان لە وڵاتی ( سوید ) دادەمەزریت و داوای لی دەکریت کە بگاتە ئەو کۆمپانیایە و وەك فرۆکەوانیك کار بکات و لە هەمانکاتدا ئەرکی بریکاری کۆمپانیایەکی دروست کردنی ( پەرەشوت ) ی گرتبوە ئەستۆ . کاری فرۆکەوانیەکەی تایبەت بوو بە گوێستنەوەی پیاوانی ناودار و خاوەن پلەو پایە و کەسیتی. لە زستانی ساڵی ( 1940 ) دا داوای لیکرا هەستیت بە گوێستنەوەی کۆنت ( ئەریك فۆن روزن ) ی سویدی لە فرۆکەخانەی شارەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی هەرچەندە کۆشکەکە و فرۆکەخانە ئەوەندە لە یەکترەوە دوورنەبوون بەڵام لە ئەنجامی ناخۆشی باری ئاو هەواو و بارینی بەفر گۆرنگ ڕێگە هەلە دەکات و پاش هەوڵ و کۆششیکی زۆر بە ناچاری لەسەر یەکیك لە دەریاچە بەستوەکانی نزیك کۆشکەکەوە دەنیشیتەوە ، کە دەریاچەی ( فۆن ) بوو و لە کۆشکی ( رۆکلستاد ) بوو ، ناوچەکە دەریاچەی جۆراوجۆر و دراستانی چڕوپڕی تیدا بوو لە پاشاندا کۆنت ( ئەریك ) داوای لە گۆرنگ کرد کە شەو لەگەل ئەودا بەسەر بەریت و لە کۆشکەکەدا بمینیتەوە شایانی باسە ، زۆرشت لەو کۆشکەدا سەرنجی گۆرنگی ڕاکیشابوو لەوانە ئەو وینە و دیمەنە جۆرا و جۆرانەی بە دیواری کۆشکەکەدا لە ناوەوە هەلواسرابوون لەگەل وینەی باوك و باپیرانی کۆنت ( ئەریك ) و زۆر بە

شـیوازی وینەکانیـان و ئەو جـل و بەرگـانەی ئەو کـاتەی کە لە بەریانـدابوو خۆشـحاڵ بـوو لە پاشـان کە کاتیـك سـەرهەڵدەبریت فەروە و کەڵە سـەری زۆر لە ئاژەڵە دڕندەکان بەدی دەکـات ، وشك کـراون لە هەمـوو ئەمـانە جـوانتر کە بەدی دەکات ئەو شۆخەی کە لەو کۆشکەدا بوو و خوشکی خیزانی کۆنت بوو سـەردانی کردبوون و هاتە لای گۆرنـگ و کۆنـت و لە نزیك ئـاگردانەکە دانیشت ئەو کچە شـۆخە کە سـەرنجی گـۆرنگی ڕاکیشـا نـاوی (

کارین فۆن کانتزوف ) بوو و گۆرنـگ لە یەکەمین دیدارەوە خۆشـی ویسـت پـاش ئەوە لەگەڵ کۆنت دەست دەکەن بەوتنی گۆرانییە نەتەوەییە ئەڵمانی و سویدیەکان

.

باوکی ( کارین ) بارۆن ( فۆك ) یەکیك بـووە لە ئەفسـەرانی سوپای سویدی و دایکـی ئینگلیزی بـووە و لە ( ئیرلەنـدە ) ژیـاوە و بـاوکی لە بەشـی پاسـەوانی پادشایەتی بە ناوبانگی بەریتانی کە بە ( گۆلد ستریم ) ناسرابوو کاری کردبوو .

( کـارین ) شـوی کردبـوو بەڵام لە هاوسـەرەکەی جیـابوبوەوە کە کـاری دبلۆماسـی دەکـرد و مـاوەی ( 10 ) سـاڵ پـیکەوە ژیـاون و کـارین کـوڕیکی لیـی هەیە بە ناوی ( تۆماس ) لە پاش ئەوەی کە گۆرنگ دەگەڕیتەوە بۆ ئەڵمانیـا زۆر بیـری کـارین دەکـات و لە میـونخ لە سـاڵی ( 1921 )دا و لە تەمەنـی ( 28 ) ساڵیدا پەیوەندی دەکات بە زانکۆوە و دەست دەکات بە خویندنی ئابوری سیاسـی و زانستی سیاسـی . پـاش مـاوەیەك و دوای ئەوەی بە تەواوی لە هاوسـەرەکەی جیـا دەبیـتەوە (کـارین ) دیـتە ئەڵمانیـا بـۆ لای گۆرنـگ و لە میـونخ لە ( 3 ) ی فباریردا لە ساڵی ( 1923 ) دا کارین دەکاتە هاوسەری ژیانی .

گۆرنـگ لە کـاتی فەرمانڕەوایی کۆمـاری ( دیمـار) دەگەڕیتەوە ئەڵمانیـا و لە میـونخ ( حزبـی کریکـارانی نیشـتمانی سویسالیستی ئەڵمـانی ) بەرچـاو دەکەویت کە ( ئەدۆلـف هتلـر ) سـەرکردایەتی دەکـات و گۆرنـگ لە سـاڵی (

1922 ) دا گۆی بیستی یەکیك لە وتارەکانی هتلر دەبیت و خۆشحاڵ دەبیت بە نـاوەرۆکەکەی و زانیبوی کە رۆژانـی دوشـەممان هتلـر کۆبوونەوە ئەنجامدەدات بـۆیە خـۆی ئامـادە دەکـات بەشـداری ئەو کۆبـونەوەیە بکـات و گـوێ بیسـتی داواکـاری و ئامـانجی ئەو حـزبە بیـت پـاش ئەوەی کە دڵنیـا دەبیـت لە ئـاوات و خواسـتی ئەو حـزبە رۆژیـك هەوڵـدەدات کە سـەردانی بارەگـای حـزب بکـات و لەگەڵ خـودی هتلـر کـۆ ببیتەوە بـۆ ئەوەی هاوکـاری و بۆچـوونی خـۆی پیشـان

بدات پاش بیرو ڕاگۆرینەوە گۆرنگ بڕیار دەدات خۆی و هەموو توانا و خزمەتگوزاریەك بخاتە ژێر دەستی هتلر .

لەو رۆژەوە و لە تەمەنی ( 29 ) ساڵیدا دەچیتە ناو حزبی نازیەوە و پەیوەندی تەواوی پیوە دەکات .

* * *

بەشی دووەم :

# کودەتا و دورکەوتنەوە

هتلر دەربارەی گۆرنگ وتبوی کە ( بڕیارم پیداوە چەند تیپیکی بەناوی بەرگ قاوەییەکان ریك بخەم ) کە لەماوەیەکی زۆر کەمدا توانی ( 11 ) هەزار پیاو بۆ ئەم مەبەستە ریك بخات . گۆرنگ هەستی بەو هیواو متمانەیە کرد لە لایەن هتلرەوە کە ئەلمانیا دەتوانیت بگەریتەوە بۆ دۆخی جارانی گەر بیت و لەسەر ریبازی ئەم پیاوە واتە هتلر بڕۆن ، هەرچەندە ( عەریف ) یکی پیشووی سوپایە و سەرهەلدان و لە دایکبوونیشی هیچ گرنگیەك و نازناو و ناوبانگیکی نییە.

گۆرنگ و خیزانەکەی لە شاری ( میونخ ) نیشتەجێ بوون هەمیشە دەرگای مالیان ئاوەڵا بوو لە پیشوازی کردنی هتلر و هاوریکانی کە بریتی بوون لە ( رودۆلف هیس ) کە لە ساڵی ( 1921 ) ەوە پەیوەندی کردووە بە حزبی نازیەوە هەروەها کابتن ( روهم ) کە خۆی بە پیاویکی سەربازی لەحزبدا دادە نا لە جیاتی گۆرنگ لەگەل ( ئەلفرد رۆزنبرگ ) کە بە رۆشنبیر دادەنرا و لە ( بەلتیق ) ەوە هاتبوو زۆر دژی ( شیوعیەت ) بوو پاش ئەوەی ماوەیەك لە ( مۆسکۆ ) ژیابوو ( روهم ) کە تەمەنی ( 34 ) ساڵ بوو و لە گۆرنگ بەتەمەنت ربوو وا خۆی پیشان دەدا کە ئەو سەرۆکی ئەرکانی جەنگی حزبە . بەڵام گۆرنگ ئەوا سەرکردەی جەنگی مەیدانە یاخود شەقام چونکە ئەوکاتە مەیدانی جەنگی حزب شەقامەکانی ( میونخ ) بوو.

بـۆ یەکەمینجـار گۆرنـگ لەگەڵ ( هـیس ) دا بەیەك گەیشـتن کاتیـك کە لە زانکـۆی ( میـونخ ) گـوێ بیسـتی یەکیـك لەو وانـانە بـوون کە باسـی جەنگـی رزگاری ئەڵمانیای دەکرد دژی هێزەکانی ( ناپلیۆن پۆنابارت ) .

هیس کەستیتیەکی وشك و راست گۆ و و دلسۆز و پڕ متمانە بوو بەرامبەر هتلـر بە پـیچەوانەی گۆرنـگ کە ئـارەزووی گـاڵتە کـردن و ڕووی خـۆش بـوو لەگەڵ خەڵکیدا . شایانی باسە هتلر زۆرجار گاڵتەی بە ژنەکەی گۆرنـگ دەکرد کاتیك کە لە زۆربەی بۆنەکانـدا گۆرنـگ بە ( ئـازیزم ) بـانگی دەکـرد و ژنەکەی گـۆرنگیش بەڕێـزەوە لە هتلـری دەڕوانـی و وەك هـاوڕییەك و سـەرۆکی هاوسەرەی هەرچەندە هتلر کەمیك سەرنجی ئافرەتانی بەلای خۆیدا رادەکیشا .

هتلر دەیویست بیردۆزی ( لێك جیا بکەرەوە قازانج دەکەیت / فرق تسد ) ، لە گۆرانگـدا پیـادە بکـات هتلـر گـۆرنگی دژی روهـم دادەنـا و بە پیچەوانەشـەوە هەروەك چۆن هتلر بە بەکارهینـانی ئەو سیاسـەتە ناسراو بوو بە دریژایـی ژیـانی بەڵام پیویستی بە هاوکـاری و یـارمەتی هەمـوو نـاوداران و پیـاوانی ئەڵمانیـا هەیە چونکە روهم هتلری بە ( بیلدنـدورف ) ناسـاندبوو کە سـەرۆکی هەیئەی ئەرکـانی جەنگی پیشووی ئەڵمانیا بوو . وە مەبەستی روخاندنی دەسـەڵاتی حکـومەتی ( دیمار ) ی ئەڵمانیا پیویستی بەو کەسـانە هەیە لە جۆری ( بیلدنـدورف ) چونکە هتلر بڕیاری بەرپاکردنی شۆرشی دابوو دژی ئەو حکومەتەی ئەڵمانیـا وەك چـۆن (مۆسۆلینی ) لە ساڵی ( 1922 ) دا بەرە و ( رۆما ) رۆیشت و جلەوی حـوکمی گرتە دەست لە ( ئیتالیا ) .

بـۆ ئەم مەبەسـتە هتلـر لە وتاریکیـدا لە ینـایری ( 1923 ) دا لەگەڵ ( 5 ) هەزار لە پیـاوانی ناسـراو بە ( تیپەکـانی گەردەلـول ) هانیـدان بە پیویسـتی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی وڵاتدا .

پیـاوانی گەردەلـول لە ( 1 ) ی مـایۆی هەمـان سـاڵدا داوایـان لە سـەرکردەی سوپای ( پاڤاریا ) کرد پەیوەندیان پیوە بکـات ، بەڵام ئەو سـەرکردەیە کە پلەی ( جەنەڕال ) بوو ئەو داوایەی ڕەت کردەوە هەرچەندە حکومەتی ئەوکاتەی ئەڵمانیـا ئەو هیـزو و توانـایەی نەبـوو بەڵام لە دژی هەرجـۆرە سەرکیشـی و کودەتـا و شۆرشیك دەوەستا .

هەر لە ( 1 ) ی مـایۆی ( 1923 ) دا ( پیـاوانی گەردەلـول ) کە سـەر بە حزبـی نـازی هتلـر و گۆرنـگ بـوون خۆپیشـاندانیکیان ئەنجامـدا دژی شـیوعیەکان

که هەموو رۆژێك لەو ساڵە دا ئاهەنگی خۆیان دەگێرن بۆ ئەم مەبەستە گۆرنگ و سەرجەم ئەندامانی حزب هەموو نیشان و جل و بەرگی سەربازی خۆیان که کاتی خۆی له جەنگدا پێیان بەخشرابوو لەبەر کرد و روهم هەوالیدا که لەو ئاهەنگەدا سەربازانی سوپا چەکەکانیان بدەنە دەست پیاوانی حزب بەڵام ( فۆن لوسوف ) ی وەزیری جەنگی ئەوکاتە له دژی هەموو ئەو هەوڵانەی روهم و حزبەکەی وەستاو ناچار پاشەکییان کرد .

له مانگی نۆڤەمبەردا هتلر بڕیاریدا که بە زەبری هیز له سوپا بدات و بۆ ئەم مەبەستە پیلانیکی دارشت . جەنەڕال ( لودندورف ) پشتگیری حزبی دەکرد و جیی کردبووە وە له ئەلمانیا دا و رۆژی ( 8 ) مارس دەستنیشان کرا بۆ ئەنجامدانی کودەتا ، کۆبونەوەیەك له هۆلی ( بیره ) له ( بورجریورکلر ) لەلایەن نازی سازکراو ( جوستان فۆن کاهر ) که وەزیر بوو له حکومەتی ئەلمانیادا ئامادەی ئەو کۆبونەوەیه بوو لەگەل جەنەڕال ( فۆن لوسوف ) و چەند وەزیریکی ترو لەم کاتەدا و له دەرەوەی هۆلەکە هتلر و گۆرنگ ژنەکەی بە ناساغی لەلای ژن خوشکەکەی جیهیشت و چوو بۆ ئەو کۆبونەوەیه و بەڵام جەنەرال ( لودندورف ) هیشتا نەگەیشتبووە جی پاش کەمیك و لەو کاتەی که ( فۆن کاهب ر) خەریکی خویندنەوەی وتاریك بوو دەنگی گوللەیەك بیسترا و هەموو ئامادەبووان پەرداخە بیرەکانیان له بەردەمیاندا دانا و ( فۆن ) یش له نیوەی وتارەکەدا وەستاو هتلر و پاسەوانیکی تایبەتی خۆی که زۆرانبازیکی پیشوو بوو بەرەو دەنگەکە رۆیشتن و بە دوایدا گۆرنگ و هیس ، له پاشان هتلر چووە سەر میزیك و گوللەیەکی بە دەمانچەکەی خۆی ئاڕاستەی ( سەقفی ) هۆلەکە کردوو پاش ئەوەی که سەرنجی هەموانی بەلای خۆیدا راکیشا چووە جیگەکەی وەزیر( فۆن کاهبر ) و بە ئامادەبوانی ڕاگەیاند که وا ( شۆرشی نیشتمانی ) دەستی پی کردوو ( 600 ) کەس ئابلوقەی ئەم هۆلەیان داوە و کەس ناتوانیت دەرباز بیت شایانی باسە ئامادەبووان وا هەستیان کرد که ئەمە نەك هەر مانای کۆتایی هاتنی حکومەتی پاڤاری ناگەیەنیت بەلکو واتای کۆتایی هاتنی هەموو حکومەتی ئەلمانیا دەگەیەنیت ناچار وەزیرەکان و له ژیر زەبری دەمانچەی هتلردا له ژووریکی بچوکی ناو هۆلەکە کۆنگرەیەکی خیرایان لەگەل هتلردا سازکرد ، هتلر چاوەڕوان بوو که ( لودندروف ) بگاتە جی و له هەوڵی رازی کردنی وەزیرەکان و ئامادەبوواندا بیت بەڵام پاش ئەوەی

كە ( لودندروف ) دواكەوتبوو نەهات هتلر وەزیرەكانی لە ژوورەوە جیهیشت و بەرەو ( ڵاقتە ) ی قسەكردنەكە رۆیشت و بە ئامادەبووانی ڕاگەیاند كە وا (حكومەتیكی هەمەلایەن ) دامەزراو ئەو واتە هتلر بە پلەی ( وەزیری بەرپرس لە بەڕیوەبردنی سیاسی / وزیرا مسئولا عن التوجیە السیاسی ) لەو حكومەتەدا پیدراوە هەروەها رایگەیاند كە بە هاوكاری لەگەل ( لودندروف) دا ئەم ڕیبازە بەرەو ( بەرلین) دەبەن . لەم كاتەدا لودندروف دیت پاش ئەوەی توڕە دەبیت لەبەرئەوەی هتلر هیچ ئاگاداری و پرسیكی لەو بارەیەوە پێنەكردووە بەڵام هتلر بواری قسە كردنی نادات و بە (لودندروف) دەلیت كە بچیت بۆ ئەوەی ناكۆكی نیوان پیاوانی بەرگی قاوەیی و هیزی سەربازی وەزیر ( لوسوف ) چارەسەر بكات پاش ئەوەی ئامادەبوان رییان پیدرا هۆلەكە جی بهیلن دوو وەزیر لەلایەن حزبی نازیەوە وەك بارمتە بە دیل گیران و گوێسترانەوە بۆ چیاكان لەژیر سەرپەرشتی ( هیس ) دا وەزیر ( فۆن كاهبر ) یش لەلایەن ( لودندروف ) ەوە بە مەرجی رازی بوون بەو حكومەتە سەربەست كرا بەڵام لەگەل گەیشتنی ئەم وەزیرە بۆ بارەگاكەی خۆی راستەوخۆ رایگەیاند كە وا حزبی نازی هەلوەشاوەتەوە و داوای لە هاوڵاتیان كرد هیچ یارمەتی و هاوكاریەكی هتلر و حزبەكەی نەكەن .

*   *   *

# شكستهێنان و دەستگیركردنی هتلر

لە شەودا هتلر لەگەل ( لودندروف) و ( گۆرنگ ) و ( روهم ) كۆبونەوە و باس لە ئەو هەنگاوە پیویستانە كرا ، لە رۆژی ( 9 ) ی نوڤەمبەری ساڵی ( 1923 ) دا و بەجل وبەرگی مەدەنی یەوە ( روهم ) بە هاوكاری تیپەكانی

پیاوانی بەرگی قاوەیی بەرەو ناوەندی شار کەوتنە رآ و کاتیك کە بە هیزەکانی پۆلیس دەگەن لە ( لویدج ) گۆرنگ توانی بەو نیشانانەی کە بە بەرۆکیەوەیە لەگەڵ ناوهینانی بارمتەکان سەرۆکی ئەو هیزانە رازی بکات بۆ ئەوەی ری بدەن رێپیوانەکە بەردەوام بیت بەم شیوەیە خۆپیشان دەران کە بریتی بوون لە ( 3 ) هەزار کەس بەرەو هۆلی شارەوانی کەوتنەرێ و پاش کەمیك لەگەڵ هیزیکی تر بەرامبەر هاتن بە سەرۆکایەتی ( گولیوس سترایخر ) و لە ئەنجامدا ئاراستەیان گۆڕی بەرەو رووی وەزارەتی جەنگی پاڤاری کە ( روهم ) ی تیادا ئابلوقە درابوو بە هیزی سوپا . بەڵام لە ئەنجامی تیپەڕبوونی رێپیوانەکە بە شەقامیکی تەنگەبەردا کە لەسەر شەقامەکە هیزی پۆلیس لە چاوەڕوانیاندا بوون رێپیوانەکە وەستاو و پاسەوانەکەوی هتلر چووە پیشەوە و بە هیزی پۆلیس و سەرۆکەکەیانی ڕاگەیاند کە تەقە نەکەن ئیستا بەڕیز جەنەڕال ( لودندروف ) تیپەر دەبیت لەپاشان هتلر هاوار دەکات و دەلیت کە خۆتان بە دەستەوە بدەن و چەك بن بەڵام هەر لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیە ، دەستیان کرد بە گوللە باران کردنی خۆپیشاندەران بەڵام ( لودندروف ) بەبآ ترس و بەناو گوللە باراندا چووە ناو هیزی پۆلیس و ئەو پیاوەی کە لەگەڵ هتلردا بوو کوژراو هتلریش خۆی بە زەویداداو لە پاشان بەرەو دواوە هەلهات و بە ئۆتۆمبیلیك چوبووە مالی هاوڕییەکی کە ناوی ( ئارنست هانزفستیگل ) بوو و ( گۆرانگیش ) گوللەیەك بەر سمتی دەکەویت و دەچیتە مالی هاورییەکی کە جولەکە بوو و ژنەکەی پزیشك بوو بە مەبەستی چارەسەرکردنی لەکاتیکدا کە ( روهم ) و پیاوەکانی خۆیان بەدەستەوە دا لەگەڵ ( لودندروف ) و لەچەند چرکەیەکدا خۆپیشاندەران بڵاوەیان پێ کرا .

ژنەکەی ( گۆرنگ ) بەم حالەی زانی و پاش ئەوەی لەو ناساغیەی رزگاری بوبوو هات بۆلای گۆرنگ لەگەڵ خوشکەکەیدا و گۆرنگ داوای لیکرد کە هەوڵ بدات بیباتە خاکی ( نەمسا ) وە لەبەرئەوەی بڕیاری دەستگیرکردنی دەرچووە بۆ ئەم مەبەستە و بەهاوکاری خزمانی ژن خوشکەکەی توانرا گۆرنگ بە ئۆتۆمبیلیکی شارۆچکەی ( جارمیش ) بگویزریتەوە هەرچەندە کە پۆلیس بەبوونی گۆرنگی زانی لە ( جارمیش ) هەستا بەدەست بەسەرا گرتنی ( پاسپۆرت ) ەکەی و پاسەوانی کردن و چاودیری کردنی لەنەخۆشخانەدا بەڵام بە هاوکاری هاورییان و بەهۆی چەند بەلگەنامەیەکی ساختەوە توانرا

گۆرنگ بگویزریتەوە خاکی ( نەمسا ) و لەسەر سنوری نەمسا لە ( ئەنزبروك ) جیگیر بوو بەڵام بەهۆی گوێستنەوەی و ترسناکی برینەکەی ناچاربوون کە چەند جاریك نەشتەرگەری بۆ ئەنجام بدەن و بە مەبەستی لە هۆش خستنی رۆژی دووجار ( مۆرفین ی) لی دەدرا کە لە پاشاندا فیری بوبوو ، هتلر لە ( 11 ) ی نوڤەمبەردا دەستگیرکرا و گۆرنگ بەردەوام پەیوەندی هەبوو لەگەلیدا لە بەندیخانەدا و دادگا ماوەی ( 5 ) ساڵ زیندانی دا بەسەریدا و لە کۆشکی ( لاندسبێرگ ) ئەو ماوەیەی بەسەر برد کە لە بەندیخانە نەدەچوو چونکە ڕێگەی خویندنەوە و پیشوازی کردنی ئەو کەسانەی پیدرابوو کە دەهاتن بۆ لای . ( هیس ) هەستا بە خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەوەی بگاتە لای هتلر لە بەندیخانەدا .

هتلر داوای لە گۆرنگ دەکرد کە لە نەمسا بمینیتەوە و لەکارکردن بۆ حزب بەردەوام بیت و نەگەڕیتەوە ئەلمانیا بۆ ئەوەی دەستگیرنەکریت ، بەڵام گۆرنگ زۆر بێ حاڵ بوو بەهۆی وەرگرتنی بەردەوامی ( مۆرفین) و ئازاری برینەکەی و هاوکات دەست بەسەراگرتنی سامانەکەی لە پارەو پول لە ئەلمانیا ، لەم کاتەدا حکومەتی ( نەمسا ) داوای لیکرد کە خاکەکەی جی بهیلیت چونکە گەلی نەمسا نایانەویت پیاویکی وا لە وڵاتەکەیاندا بیت گۆرنگ چووە ( ئیتالیا ) و لەوێ دەستی کرد بە خویندنی هونەر و لەگەل هاوسەرەکەیدا لەوێ مانەوە تاوەکو مایوی ساڵی ( 1925 ) و لەو ماوەیەدا توانی چاوی بە ( موسولینی ) بکەویت لە پاشان و دوای ئەوەی هەوالی نەخۆشی دایکی ژنەکەی دەبیستیت بەرەو ( سوید ) دەکەونە رێ لەگەل هاوسەرەکەیدا و خانوویەکی بچوك لە ( ستۆکهۆلم ) ی پایتەخت بەکرێ دەگرن و گۆرنگ لەم کاتەدا تەمەنی ( 32 ) ساڵ دەبیت و هیچ پارەو پولیك و سەرچاوەیەکی بژیوی نییەو بێ کارە و کیشی لەشی زیادی کردوە و فیری وەرگرتنی ( مۆرفین ) بووە و ژنەکەی دووچاری نەخۆشی دەبیت حالیان زۆر نالەبار دەبیت بەهۆی کەمی پارە و خراپی تەندروستی. گۆرنگ ناوبەناو توشی بورانەوە و لەهۆش خۆ چوون دەهات زۆر توڕە دەبوو کە وا یکرد بخریتە نەخۆشخانەی دەرونی و عەقلی لە ( لبفیرو ) هەرچەندە کە بە زۆر خرایە ئەو نەخۆشخانەیەوە پاش ئەوەی کە جل و بەرگی شیتیان لەبەرکرد ئەمە لە سبتەمبەری ( 1925 ) دا .

بەڵام چونکە زۆر ڕق ئەستور و خۆراگر بوو توانی لە بەندیخانە لە (مۆرفین ) دور بکەویتەوە و لە دوای ( 3 ) مانگ توانی نەخۆشخانە جیبهیلیت

لەگەڵ بەردەوامــی وەرگرتنــی چارەســەرکردنی ناوبەنــاو پــاش چــاکبوونەوەی ژنەکەی لە ( سوید ) جی دەهیلیت و دەگەریتەوە بۆ ئەلمانیا و ماوەیەك لە هتلر دابڕابوو لەم کاتەدا پاش بەسەربردنی ( 18 ) مانگ لە بەندیخانە هتلر بەردەبیت و دەست دەکاتەوە بە دامەزراندنی حزبەکەی وە دەچیتە هەلبژاردنەوە و ( 14 ) کورسی لە پارلەماندا بۆ حزبەکەی دەباتەوە و لە ساڵی ( 1927 ) دا دەبیت بە ســەرۆکی حــزب لە پاشــاندا لەگەڵ گۆرنــگ بەیەك دەگەن بەڵام هــیچ پــلەیەك لەحزبدا نادات بە گۆرنگ تاوەکو حال و گوزەرانی دیتەوەسەر خۆ .

لە پاشــان گۆرنــگ دەگەریــتەوە لە ( میــونخ ) ەوە بــۆ ( بەرلــین) و دووبــارە دەبیتەوە بە بریکاری چەند کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی و چاوەڕوانی چەند هەلیکە بۆ گەڕانەوەی بۆ ناوحزب .

* * *

# بوون بە ئەندامی گۆرنگ لە پارلەماندا

لە هەلبژاردنەکانی ساڵی ( 1928 ) دا گۆرنگ توانی هتلر ڕازی بکات کە وەك نوینەری پاڤاریا خۆی بپاڵیویت هتلریش ئارەزووی پاڵاوتنی بوو بەو پێیەی کە کۆرنــگ خــاوەنی میــژوو و ســەروەریەکی زۆرە لە جەنگــدا و هەروەهــا پەیوەنــدی تونــدو تــۆلی هەیە لەگەڵ حــزبە راســت ڕەو و کەســایەتییە دەولەمەنــدەکانی نــاو کــۆمەل هەر بــۆیە رەزامەنــد بــوو بە پــاڵاوتنی گۆرنــگ بــۆ ئەنــدامیتی پارلەمــان ، گۆرنــگ بــووە ئەنــدام پارلەمــان لە نیــوان ( 12 ) ئەنــدامی نــازی کە لە ناویانــدا پزیشــکیکیش هەبــوو بە نــاوی ( گــۆبلز ) بەم جــۆرە

گۆرنگ دەیتوانی سواری شەمەندەفەری ژمارە ( 1 / درجە أولی) بیت لە بەرلینەوە کە ناوەندی کاری بازرگانیەتی بوو بەرەو پاڤاریا کە وڵاتی هەلبژاردنەکەیەتی . شایانی باسە نازیەکان لەم هەلبژاردنەدا تەنها ( 810 ) هەزار دەنگیان بەدەست هینا لە کاتیکدا کە حزبی سوسیالیستی دیموکرات زیاتر لە ( 9 ) ملیۆن دەنگیان بەدەست هینا و شیوعیەکانیش ( 3.500 ) ملیۆن و پینج سەد دەنگیان بەدەست هینا بوو.

پاش ئەوەی گۆرنگ بووە ئەندام پارلەمان حالی لە رووی پارەو خەرجیەوە باش بوو و ( فزاتزتیسن ) کە بە پیاوی پیشەسازی ناسرابوو لەو روەوە یارمەتی دەدا لەلایەکی ترە بەهۆی بوونە ئەندامی لە (رایشتاغ) کە تەلاری پارلەمانی ئەلمانیا بوو ئیشوکارە بازرگانیەکانی پەرەی سەند . هەمیشە لە پەیوەندیدا بوو لەگەل ( ئیرهارد میلیش ) سەرۆکی کۆمپانیای (لوفتهانزا) ی تایبەت بە فرۆکەوانی پاشان گۆرنگ و هاوسەرەکەی دەچنە خانویەکی قەشەنگەوە لە شەقامی ( بادن شتراس ) و میوانەکانیان کەسایەتییە ناودار و دەولەمەندەکان بوو لە نمونەی ( فۆن تیس ) ئەنجا هەلسا بە کۆبونەوە لەگەل ( گۆبلز ) و ئەندامانی تری حزب و بڕیاریدا کە بە هاوکاری کۆمپانیای( لوفتهانزا ) سەر لە نوێ چەکی ئاسمانی ئەلمانیا بنیاد بنیتەوە ..

هتلر لەجیی خۆی نە دەترسا وەك سەرۆکی حزب لەلایەن گۆرنگ و گۆبلز و روهمەوە بەڵام زۆر دوودل بوو بەرامبەر بە هەردوو برا کە بە (شتراسر ) ناسرابوون و لە پیشکەوتوخوازانی حزب بوون و بەلای چەپدا دەڕوانن . زۆرجار دژایەتی هتلر یان دەکرد بۆ لابردنی لەسەر دەسەڵاتی حزب و رزگاربون لە هەلسوکەوتی دکتاتۆریانەی هتلر لە بەڕێوەبردنی حزبدا . ئەم دژایەتی کردنەش بە تەواوی کاتیك سەری هەلدا کە لە ساڵی ( 1930 ) دا جولیوس شتراسر پشتگیری تەواوی ئەو خۆپیشاندانە جیهانیەیان کرد کە لە دژی خاوەن کارەکان ئەنجامدرا بوو کە پارە و پۆلیکی زۆریان دەدایە هتلر بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا لە کریکاران بیانپاریزیت و نەهیلیت جووڵانەوەی شیوعیەت بڵاوبیتەوە و تەشەنە بکات . بەم شیوەیە هتلر هەستا بە دوورخستنەوەی ئۆتو شتراسر لە حزب و لە ئەندامیتی خستن لە پاشان ( ئۆتو ) هەستا بەدروستکردن و دامەزراندنی حزبیکی دژ بە حزبی نازی و ناوی نا ( شەرگەی ڕەش ) .

نازیەکان توانیان پیشکەوتنیکی بەرچاو بەدەست بهینن لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ( 1930 ) کاتیك کە توانیان ( 107 ) کورسی وەربگرن لە پارلەماندا لە ( رایشتاغ ) کە بریتی بوو لە دەنگی ( 6 ) ملیۆن و پینج سەد هەزار دەنگدەر وە بۆ ئەوەی بنکەی جەماوەری حزب زۆر فراوانت ربیت و پشتگیری نازی زیاتر بیت حزب بڕیاریدا چارەسەری کێشەی بآ کاری بکات لە ئەلمانیادا پاش ئەوەی کە ئەمریکا زۆربەی پرۆژەکانی لە ئەلمانیادا کیشابوەوە بە هۆی ئەو قەیرانە خەرجییەی کە (دولستریت ) ی تیکەوتبوو لە نیۆیورك ساڵی ( 1929 ) .

لەم پیناوەدا هتلر هەستا بە بەکارهینان و جوڵاندنی پیاوانی سەرمایەدار و پیشەسازمەندو پیاوانی ئابوری ناو ئەلمانیا کە لە نیوانیاندا گۆرنگیش هەبوو کە خۆی ناساندبوو بە پزیشك ( شاخت ) بەڕیوەبەری بانکی ( رایخ ) هتلر بە توندوتۆلی پەیوەندی لەگەڵدا بەستبوون بۆیەکەمینجار لە ڕێگەی گۆرنگەوە هتلر چاوی کەوت بە ( هلمار شاخت ) لە ساڵی ( 1931 ) دا . شایانی باسە کە سیاسەتی هتلر لە ساڵانی ( 1930 ، 1931 ، 1932 ) بریتی بوو لە پەیداکردنی متمانە و پشتگیری خاوەن بانك و پیاوانی پیشەسازی و نیشتمان پەروەران لە ڕێگەی پەیوەندی کردنی تایبەتی پێیانەوە ، بەڵام لەلایەن دەنگدەرانەوە ئەوا گفتی نەهیشتنی بێکاری دراوە لەلایەن حزبی نازیەوە لەو کاتەی کە ریژەی بێکاران لە ئەلمانیادا گەیشتبووە ( 30 ) ملیۆن لە ساڵی ( 1930 ) دا کە بەشیکی زۆریان چووبونە ریزی ( پیاوانی بەرگی قاوەیی ) بەهۆی بێکاریەوە بۆ ئەوەی کاتی بەتالیان بەسەربەرن .

# مردنی ژنی گۆرنگ و کاڕێگەری لەرسەری

باری تەندروستی هاوسەری گۆرنگ رۆژبەرۆژ بەرەو خراپی دەچوو بە تایبەت پاش ئەوەی کە زۆر بە هیلاک دەچوو بەهۆی خزمەتکردن و هەڵسوڕان بە دەم میوانەکانی گۆرنگی هاوسەری و هەر کاتێك هەڵەیەکی گۆرنگی ببیستایەتەوە لە حزب و حکومەتدا زۆر نیگەران دەبوو لە پاش ماوەیەك گۆرنگ دەبێتە سەرکردەی بەرهەڵستکاران لە پارلەماندا بەرامبەر بە حکومەتی سویالیست دیموکرات خوازەکان کە زۆرترینیان لە ئەنجومەن کاسولیکەکانی ئەڵمانیش پشتگیریان دەکەن چونکە پروپاگەندەی ( بێ دین) بەرامبەر نازیەکان هەبوو .

هەرچەندە کە گۆرنگ ( بروتستنتی ) بوو بەڵام تاکە ئەندام بوو کە هەوڵی نزیك بوونەوەی لە ( کاسولیك ) دەدا . لە مایوی ساڵی 1931 دا نیردرا بۆ ( رۆما ) بۆ ئەوەی بتوانیت وەزیری دەرەوەی ئیتالیا رازی بکات کە ( کەردینال ماسیللی ) بوو کە لە پاشاندا بووە ( پاپا لویسی 12 ) هەم کە گەر نازی دەسەڵات لە ئەڵمانیا بگریتە دەست ئەوا کلیسەی کاسۆلیك وەك خۆی دەمینیتەوە و لە بەرامبەردا ( پاپای کاسۆلیك ) لە ئەڵمانیادا داوای هەموو جۆرە گیر و گرفتیك دەکات لە دژی هتلر .

لەلایەکی ترەوە کەلین کەوتبووە نیوان حزبە کەمینەکانی ناو پارلەمان و بە مەبەستی رووخاندنی حکومەتەکەی ( فۆن یورنخ ) گۆرنگ هەستا بە کیشانەوەی ئەندام پارلەمانە نازیەکان لە فبرایری ( 1931 ) دا و بە پچڕاوی لە کۆبونەوەکانی پارلەمان مانەوە تاوەکو مانگی سبتمبەر گۆرنگ هەوڵیدەدا جەنەڕال ( فۆن شیلخر ) بەلای خۆیدا رابکیشیت ، بەڵام نەیتوانی لە پاشان هەستا بە سازکردنی چاو پیکەوتنیك بۆ هتلر لەگەل (هندنبرگ) سەرۆك کۆماری ئەڵمانیا .

شایانی باسەکە سەرۆك کۆمار ئەلفیلد مارشالیکی بەساڵاچوو بوو (84) ساڵ تەمەنی بوو ، بەڵام هەردووکیان نەیانتوانی کە سەرۆك کۆمار رازی بکەن .

لە ( 17 ) ی ئەکتۆبەردا گۆرنگ ژنەکەی لە وڵاتی ( سوید ) دەمرێ و بە پەلە دەگەریتەوە بۆ ( ستۆکهولم ) و لەسەر گۆرەکەی چۆك دادەدات و بە کوڵ دەگری لە پاش ریوڕەسمی مالئاوایی گۆرنگ دەگەریتەوە بۆ ئەڵمانیا و لە میوانخانەی ( کیزرهوف ) نیشتەجێ دەبیت هتلر ئەو میوانخانەیەی کردبووە ناوەندی بەڕێوەبردنی هەڵمەتی هەڵبژاردنی نوێ .

گۆرنگ بە هەموو توانایەوە لەو هەڵمەتەدا بەشداری کرد بەستنی کۆبونەوە و وتار خویندنەوە و چاوپیکەوتن لەگەڵ دەنگدەراندا ئەم هەڵبژاردنە تایبەت بوو بە دەستنیشان کردن و هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریکی نویٚ بۆ ئەڵمانیا و تیایدا هتلر خۆی لە دژی ( هندنبرگ ) پاڵاوتوە و بە ( 7 ) ملیۆن و پینج سەد هەزار دەنگ دەرنەچوو بەرامبەر بە ( 18 ) ملیۆن و نیو بۆ ( هندنبرگ ) و ( تالمان ) ی شیوعیش ( 5 ) ملیۆن دەنگی بە دەست هینا بوو . هتلر توانی لە راکیشانی دووەمدا ( 2 ) ملیۆن دەنگی دیکە بە دەست بهینیت بەڵام هەر نەیتوانی بەسەر ( هندنبرگ ) دا سەر بکەویت کە زۆربەی دەنگەکانی بە دەست هیناوە .

سۆسیالیستە دیموکراتیخوازەکان لەوە دەترسان کە هتلر پەنا بباتە بەر ئەنجامدانی کودەتای سەربازی بە هاوکاری و پاڵ پشتی هیزەکانی لە پاسەوانی رەش و پیاوانی بەرگی قاوەیی هەر بۆیە بڕیاریاندا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو هیزو تیپانە .

لە ( 13 ) ی ئەپریلی ( 1932 ) دا گۆرنگ توانی کە بە نهینی هاوکاری و پشتگیری ( فۆن شیلخر ) وەربگریت و توانی کە راویژکاری سەرۆك (برونج) قایل بکات دەست لە کار بکیشیتەوە . پاشان ( هندنبرگ ) هتلر بانگ دەکات و پآی رادەگەیەنیت کە نا هیلیت دەسەڵاتی حوکم لە ئەڵمانیادا بگریتە دەست و ئەوەی دەسەڵات دەگریتە دەست ( فۆن باین ) ە ، ویرای نیگەرانی هتلر وتی کە ئامادەیە هاوکاری ( فۆن باین ) بکات گەر بیت و رآ بدات پیاوانی پاسەوانی ڕەش و تیپەکانی بەرگی قاوەیی دەست بە چالاکیەکانیان بکەوە کە هەرواش بوو لە دوایدا .

لە یولیوی ( 1932 ) دا جاریکی دی هەڵبژاردنە گشتیەکانی ئەڵمانیا دەستی پیٚ کرایەوە و تیایدا نازییەکان بوونە خاوەنی ( 32 ) کورسی پارلەمان کە برتی بوو لە سآ بەشی هەموو دەنگدەران بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ( هندنبرگ ) هتلر بە شایەنی گرتنە دەستی دەسەڵات نازانیت هەرچەندە هتلر دەیزانی گەر بیت و بتوانیت هندبنرگ لەسەر حوکم لا ببات ئەوا هیچ پاڵیوراویکی جگە لەخۆی نییە بۆ گرتنە دەستی جڵەوی حوکم لە وڵاتدا .

کاتیك کە ( رایشتاغ ) دادەنریت گۆرنگ توانی لە ئۆگەستی ( 1932 ) دا ئەوەندە دەنگ بۆ خۆی پەیدا بکات کە ببیتە سەرۆکی ئەنجومەن بەم شیوەیە ئەو پیاوەی کە بەر لە ( 7 ) ساڵ خرابووە نەخۆشخانەی دەرونی و راهاتبوو

لەسەر وەرگرتنی بابەتە لە هۆش بەرەکان بووە سەرۆکی هەیئەی تەشریعی گەلی ئەلمانی . بەم پێیە ریی پیدرا کە لە کۆشکی تایبەت بە سەرۆکی پارلەمان نیشتەجێ ببیت کە لە پاڵ تەلاری حکومەتدا بوو واتە تەلاری پارلەمان گۆرنگ هەموو گرنگیەکی دا بە هەوڵدان بۆ لەسەر کار لابردنی حکومەتەکەی ( فۆن باین ) ئەویش بەهۆی کیشانەوەی متمانەی ئەنجومەن لە ڕێگەی بەش بەش کردنی بەرهەلستکاران لەناو ئەنجومەندا .

بەڵام ( باین ) ئاگاداری ئەم هەواڵانە بوو بۆیە داوای لە ( هندنبرگ ) کرد کە بڕیاری هەلوەشاندنەوەی ئەنجومەن بدات بە یاسای ( فریاگوزاری / الطواريء ) کار بکات .

ئەنجا گۆرنگ هەستا بە کۆکردنەوەی ئەنجومەن و ئەندامانی و لەم کارەی ( باین ) ی ئاگادار کردن لە پاشان ئەنجومەن بە کۆی ( 513 ) دەنگ باینیان تاوان بارکرد و کاتیك کە ( فۆن باین ) بڕیاری هەلوەشاندنەوەی ئەنجومەنیدا گۆرنگ وتی کە ئەو کارە گرنگی و هیزی نییە چونکە لەلایەن پیاویکەوە دراوە ئەنجومەن متمانەی لی سەندۆتەوە و چیتر راویژکاری سەرۆك نییە لەگەل ئەوەشدا ( هند نبرگ ) هەستا بە هەلوەشاندنەوەی پارلەمان و دەستنیشان کردنی رۆژیك بۆ هەلبژاردنی نوێ کە تیایدا نازیەکان کە تیایدا نازیەکان ( 34 ) کورسیان لەدەستدا کە بریتی بوو لە دەنگی ( 2 ) ملیۆن دەنگدەر لە پاشان گۆرنگ دەچیت بۆ ئیتالیا بۆ حەوانەوە و چاوپیکەوتنی ( موسولینی ) و لە پاشان دەگەریتەوە ئەلمانیا و دەبینیت کە هیشتا ( هندنبرگ ) سووره لەسەر دوورخستنەوەی دەسەڵات لە ( هتلر ) بەو پێیەی کە تەنها ( 100 ) کورسی پارلەمانی بەدەست هیناوە لە دیسەمبەری ( 1932 ) دا ( شلنجر ) دەبیتە سەرۆکی ئەلمانیا لەم کاتەدا ( جولیوس شتراسر ) قایل نەبوونی ( هندبنرگ ) ی بەرامبەر بە هتلر بە هەلە زانی بۆ ئەوەی کە خۆی بپاڵیویت لە دژی حزبی نازی بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات ( شلنجر ) دەیویست ( شتراسر ) بکاتە جیگری راویژکار کاتیك کە ئەنجومەن پیکهاتەوە و دەستی کردەوە بە بەستنی کۆبونەوەکانی گۆرنگ بە هاوکاری ( فیودور لیبرت ) کە سەرکردەوی کریکاران بوو و جی متمانەی سۆسیالیست و یدموکرات خوازەکان بوو توانی خۆی بپاڵیویت بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەن و سەرکەوتن بەدەست بهینیت . بەڵام هتلر تەواو نیگەران بوو بەو داواکاریەی ( شتراسر ) و هەردووڵا لە ( 8 ) ی

مارسـدا كۆبـونـەوە و پـاش گفتوگـۆیەكی چڕوپـڕ ( شتراسـر ) وازی لە كـاری سیاسـی هینـاو چووە پاڤاریا و نوسـراوی دەسـت كیشـانـەوەی لە كاری سیاسـی بـۆ هتلر رەوانە كرد . ئەنجا هتلر هەستا بە هاوڕێ یەتـی كردنـی ( فۆن بـاین ) و لە مالی (سكوردر) كە خاوەن بانك بـوو كۆبونـەوە لـە ( 4 ) ی ینـایری ( 1933 ) دا و كۆبونەوەكە بە یەك گرتن و هاوكاری هەردوولا كۆتایی هات وا ڕاگەیەندرا .

لە پاشـان ( شلنجر ) دەست لە حوكم هەلـدەگریت پـاش ئەوەی كە پشتگیری تەواو بـۆ ئەم مەبەسـتە لەلایەن ئەنجـومەنەوە بەدەسـت ناهینیـت . فـۆن بـاین هەلدەسیت بە چاوپیكەوتن لەگەل ( هندنبرگ ) و قـایلی دەكـات كە هتلر دەسـەڵات بگـریتە دەسـت و ببیـتە سـەرۆكی حكـومەتی نـویی ئەلمانیـا و بڕیـاری دەسـت بەسەراگرتنی هەلەشەیی و توندڕەوی هتلر بە هندنبرگ دەدات .

لە كۆتاییـدا ( هنـد نبـرگ ) قایـل دەبیـت بە وەرگرتنـی پـلەی (راویژكـاری ) لەلایەن هتلرەوە هەرچەندە كە پشتگیری تەواوی نییە لەلایەن ئەنجومەنەوە جگە لە متمانەی چەند حزبیكی بچوكی ناو پارلەمان نەبیت هەروەها ڕێكەوتن لەسەر ئەوەی كە بـاین جیگر بیت و سآ بەشـی وەزیرەكـان لە دەرەوەی حزبـی نـازی بـن كە ئەمەكش ئەوە دەگەیەنیـت حزبـی نـازی دەبیـت خـاوەنی دوو وەزیـر بیـت لەو حكـومەتەدا هتلـر بەم داوایە رازی بـوو بە مەرجـی گۆرنــگ وەك وەزیریـك لە گەلیدا بیت وە وەزیـرەكەی تـریش نـاوخۆی ( بـلا روسیا ) ی پـێ بسـپیریت واتە وەزیری ناوخۆی (بلا روسیا ) كە بەهیزترین ویلایەتی ئەلمانیا بوو .

شایانی باسە لە ( 31 ) ینـایری ( 1933 ) دا هتلـر دەبیتە سـەرۆكی ئەلمانیـا لە و بەروارەدا كە هەتا هەتایە جیهان ئەو بەروارە لە بیر ناكات .

بەشی سیهەم:

# لەسەرکورسی فەرمانڕەوایی

لە ( 31 ) ی ینایری ( 1933 ) دا جەماوەری پشتگیر و لایەنگری حزبی نازی ڕژانە سەر شەقامەکان و ئاهەنگ گیڕان بە بۆنەی وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن حزبەکەیانەوە سازکرا.

گۆرنگ چەند کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری بۆ بیانیەکان سازکرد هەر لەو شەوەدا هتلر یەکەمین کۆبونەوەی خۆی لەگەڵ وەزیرەکاندا بەست بە تایبەت ئەو وەزیرانەی کە لە دەرەوەی حزبەوە هاتبوون بۆ ئەوەی لە هەڵسوکەوتیان شارەزا بیت کە هەموو وەك ( فۆن باین ) پیاوی بەڕیز و یەکی یەکی بوون ، ئەمانە بوون ( باین ) خۆی کە جیگری راوژیکار ، (فۆن فوراپ) وەزیری دەرەوە ، کونت ( شکورن فۆن کورنسیبك ) وەزیری جەنگ و سەرکردەی گشتی هیزی چەکداری ئەلمانیا .

لە پاشان هتلر هەلدەسیتە سەر پێ و لە پەنجەرەی تەلاری بارەگای راویژکارانەوە سەیری ئەو ئاهەنگ و نمایشانەی دەکرد کە پیاوانی بەرگی قاوەیی لەسەر شەقامەکان سازیان کردووە بە بۆنەی سەرکەوتنەوە . لە کاتیکدا ( هندنبرگ ) یش بە هەمان شێوە دەیڕوانیە ئەو جەماوەرە سەرشیتەی کە بە پێی خۆی بەرەو دۆزەخ دەچیت .

گۆرنگ وتاریکی خویندەوە کە بریتی بوو لەوەی ( ئەمڕۆ رۆژیکی نوییە بەلای گەلی ئەلمانیاوە و هەموو ئازارەکان چارەسەر دەکرین و گرنگی بە هیزی سەربازی پیشوو دەدریت ) .

هتلر لەلای خۆیەوە هەستی بە نائارامی دەکرد چونکە دەیزانی گەربیت و پشتگیری تەواوی ئەنجومەن بەدەست نەهینیت ئەوا سەرئەنجام وەك (فۆن شلنجر) و ( فۆن باین ) ی لی دیت بۆ رۆژی دوایی پارلەمان هەلدەوەشیتەوە و رۆژی ( 5 ) ی مارس دادەنریت بۆ هەلبژاردنی نوێ .

بەم شیوەیە گۆرنگ سآ پلەی دەبیت لەو حکومەتەدا کە هتلر سەرۆکیەتی کە ئەوانیش وەزیری دەولەت لە رایخ و وەزیری فرۆکەوان و وەزیری ناوخۆی ( بلا روسیا ) لە ژیر سەرپەرشتی فۆن بایندا بەو پێیەی وەزیری ( بلا روسیا ) یە لە ئەنجومەنی وەزیرانی یەکگرتوودا بەڵام گرنگترین پلە لەو ماوەیەدا پلەی وەزیری ناوخۆی ( بلاروسیا ) بوو کە (بەرلین) بە پایتەختی دادەنرا بەم پێیە گۆرنگ دەستی گرتبوو بە سەر تەواوی هیزی پۆلیسی ئەو ویلایەتە .

یەکەمین کار کە گۆرنگ پێی هەستا لەسەر کار لاَبردنی ( 22 ) بەڕیوەبەری پۆلیس بوو لە کۆی ( 32 ) بەڕیوەبەر بە دوایاندا هەزاران لە چاودیر و سەرپەرشتیاری پۆلیس و پیاوانیان لەسەر کار لاَبران و لە جیگەیان پیاوانی پاسەوانی ڕەش و بەرگی قاوەیی دامەزران کە هەموو نازی بوون بە مەبەستی خۆ سازدان بۆ هەلبژاردنی نوێ ، پزیشك (گۆبلز) دەستی کرد بە هەلمەتی پروپاگەندە لەبەرامبەر هەموو چینەکانی گەلی ئەلمانیا هەر لە سەرۆك خیزان و کریکار و فەرمانبەران کە گوێیە مانەوە و بەردەوامی حزبی نازی لەسەر دەسەڵات تاکە زامنە بۆ نەهیشتنی کەم دەرامەتی و بێکاری بەڵام ئەم کارە بە تەنها زامنی هەلبژاردن و بردنەوەی نەدەکرد بۆیە بە باش زانرا کە هەموو جۆرە چالاکیەکی حزبی شیوعی قەدەغە بکریت و رییان نەدا هیچ جۆرە کۆبونەوەیەك ئەنجام بدەن بە مەبەستی پروپاگەندەکردن بۆ هەلبژاردن ، بۆ ئەم مەبەستە حزبی نازی پەنای بردەبەر هیزی پیاوانی بەرگی قاوەیی بۆ ئەوەی هەمو جۆرە کۆبونەوە و پروپاگەندەیەکی حزبی شیوعی بلاوە پێ بکات بە زەبری هیز و لە هەمانکاتیشدا وریای کۆبونەوەکانی حزبی نازی بن لە دەست تیوەردانی شیوعیەکان .

لیرەدا شیوعی و سۆسیالیست و دیموکرات خوازەکان خۆیان لەبەردەم هیرشی نازیەکاندا بینی ، بیئەوەی پۆلیس هیچ دەخالەتیك بکات بۆ پاراستنیان لەم کاتەدا گۆرنگ لە وتاریکدا لە ( دورتمند ) پیاوانی پۆلیسی هاندا بە تەقە کردن لە هەر کەسیك گەر بەرهەلستی پۆلیس بکات و پەیمانی دانآ کە لە هەموو گیروگرفتیك بیان پاریزیت بۆ بەرگری کردن لەخۆیان ئەنجامی بدەن .

وردەوردە پیاهەلپژان و پیکدادان سەری هەلدا و خوین ڕژا و شیوعیەکان بڕیاریاندا بەرپەرچی ئەم هیرشەی نازیەکان بدەنەوە لە پاشان گۆرنگ داوای یارمەتی و هاوکاری هیزی پیاوانی بەرگی قاوەیی کرد بۆ هاوکاری کردنی پۆلیس و ریی هاتووچۆی بێ کرێ ی لە شاردا پیدان و ئەم هیزانە هەستان بە پیچانی نیشانیکی ڕەنگی ( سپی ) لەسەر قۆلیان و گۆرنگ هەستا بەدامەزراندنی بەڕیوەبەریکی نویی پۆلیس بۆ شاری (بەرلین ) بە ناوی ( رۆدۆلف دیالز ) کە فەرمانبەریکی ئارەزومەند بوو بڕیاریدا هیرشیك بکاتە سەر ناوەندی بەڕیوەبردنی حزبی شیوعی لە بەرلین ، و لە ئەنجامدا بریکی زۆر لە بەلگەنامە و نوسراوی رەسمی کە لە پاشاندا بەکاریان دەهینا دەست بەسەرا بگریت .

لە رۆژی ( 27 ) ی فبرایری ( 1933 ) دا قوتابیەك کە لە بەردەم تەلاری ( رایشتاغ ) ەوە تیدەپەرآ تارمایی پیاویك بەدی دەکات فتیلیکی ئاگری بەدەستەوەیە و لە نهۆمی دووەمی ئەو تەلارەدایە لە ناوەوە ، پاش ئەوەی لەلایەن چەند ریبواریکی ترەوە هەست بە جموجۆل و ئاگر و دوکەل دەکەن لە نهۆمی خوارەوەی تەلاری ( رایشتاغ ) هەلدەسن بە ئاگادارکردنەوەی ئاگرکوژینەرەوەکان کە لە کات ژمیر ( 9.15 ) ی شەو چەند ئۆتۆمبیلیکی ئاگرکوژینەوە دەگەنە بەردەم تەلاری ( رایشتاغ ) کە پارلەمانی ئەلمانیایە لەم کاتەدا ئاگرتەواوی تەلارەکەی داگیرکردبوو لەناکاو گۆرنگ لە نوسینگەی تایبەتی خۆی لە وەزارەتی ناوخۆ خۆی دەکات بەژووردا و سەیر دەکات کە ئاگر لە ژوری کۆبوونەوەی گشتی بەردراوە و لەو ژورەدا لە کاتژمیر ( 9.35 ) گەنجیك بە دەستی خۆی دەگریت کە لە ناوك بەرە و سەروەی روتە و لە پانتۆلەکەیدا پیناسیکی ئەندامیتی حزبی شیوعی ئەلمانی پێیە و ناوی ( فان دیرلوب ) بوو بە ڕەچەلەك ( کەنەدی ) یە و نیمچە ناتەواوە و هەروەك هتلر وتبوی ئەم هەلە لە ئاسمانەوە هاتووە بۆ لە ناوبردنی شوعیەکان . هەلبژاردن ئەنجام دراو و حزبی نازی لەگەل چەند حزبیکی سویالیستی هاوپەیمان دەرچوو

بەبڕی ( 20 ) ملیۆن دەنگ کە مافی وەرگرتنی ( 16 ) کورسی پێ دەدان لە ئەنجومەن لەگەل ژمارەیەك کورسی دی بۆ جیگرەکان کە بریتی بوو لە (340 ) جیگر .

ئەنجا ( فان دیرلوب ) درایە دادگا بەڵام هیچ شتیکی سەبارەت بەو هۆیانە نەدرکاند کە ئایا بۆچی پارلەمانی ئاگر تآ بەرداوە هەرچەندە ئەم کارە بە تەنها ئەنجام نەدراوە ( فان دیر ) ناسراو بوو کە چەند جاریك بۆتە هۆی ئاگرخستنەوە و لە حزبی شیوعیدا چالاکە لە پاشان بە هەزاران لە خەلکی گیران و بۆیەکەمینجار گرتوو خانە لە ئەلمانیادا دروستکرا لەم بارەیەوە گۆرنگ وتی کە ئەم گرتوخانانە لەسەر نمونەی گرتوخانەکانی دیلەکانی جەنگی ( یویر ) لە باشوری ( ئەفریقیا ) دروستکراون.

ئەنجا پروپاگەندە بڵاوبۆوە کە گوێیا نازیەکان خۆیان هەستاون بە سوتاندنی پارلەمان بەڵام کراوەتە بیانوو بۆ ئەوەی حزبی شیوعی لەناو ببریت و بۆ ئەم کارە پیاوانی بەرگی قاوەیی لە تەلاری تایبەت بە سەرۆکی پارلەمان کە گۆرنگ تیایدا نیشتەجێ یە بە هۆی تونیلیکی ژیر زوییەوە چونەتە ناو تەلاری پارلەمانەوە و بریکی زۆر لە بابەتی کیمیایی کە بە خیرایی گڕ دەگری کراوە بەسەر کورسی و دەرگا تەختەکاندا و ئەنجا (فان دیرلوب ) یان هیناوە و ئاگرەکەیان پی لیداوە پاش ئەوەی کە ئەوان گەڕاونتەوە جیگەی خۆیان لە هەمان ریوە ، شایانی باسە ئەو هۆیەی کە تەواو ئەم چیرۆك و باسەی کردبوە جیی بڕوای خەلکی ئەوە بوو کە کارمەندی خزمەتگوزاری ناو تەلاری پارلەمان لە کاتژمیر ( 8.15 ) دەچیتە ناو هۆلی تایبەت بە کۆبوونەوەی گشتی و گلۆپەکان هەلدەکات و هیچ دیاردەیەك بەدی ناکات و لە کاتژمیر ( 8.50 ) ش کارمەندیکی پۆست و گەیاندن دەچیتە هەمان جیگە و هیچ بەدی ناکات بەم پێیە چۆن پیاویکی وەك ( فان دیرلوب ) توانی هۆلیکی گەورە کە جیگەی (700) کەسی تیدایە گڕ تی بەربدات لە هەمانکاتدا توانیویەتی ئەو بڕە زۆرە لە کەرەستە و بابەتی کیمیایی تەنها لە ماوەی ( 10 ) خولەکدا ئامادە بکات بەبآ هیچ یارمەتیەك شایانی باسە نازیەکان دەیانوت تەلاری پارلەمان لە کاتژمیر ( 9.00 ) گڕی تی بەردراوە.

لە نیوان ئەوانەی کە درابونە دادگا لەسەرکردەکانی حزب ( جۆرجی دیمتریوف ) کە لە دوایدا دەبیتە سەرۆك وەزیری ( بولغاریا ) هەرچەندە گۆرنگ زۆر سوربوو لەسەر تاوانبارکردنی ئەم سەرکردەیە و سەرکردەکانی

دیکەشی حزبی شیوعی بەڵام بە تەنها ( فان دیرلوب ) بڕیاری لەسیدارەدانی بەسەردا دراو سەری بە هۆی گویزانی ئەوکاتەوە لەلایەن سەربڕی یاسایی و رەسمی دەولەتەوە کە بەرگیکی تاییەتی لەبەردابووە و دەم و چاویکی دەستکردی لەسەر بووە لە ئاهەنگیکی فراواندا بڕیارەکە جیبەجآ دەکات .

لە هەلبژاردنی ( 5 ) ی مارسدا پارلەمانی نویّ لە ( بوتسدام ) دەکریتەوە لە ئاهەنگیکی گەورەدا لە رۆژی ( 11 ) ی مانگ کە تیایدا (بروتستانت و کاسۆلیکەکان ) بە ئاهەنگیکی ئاینی بەشداری دەکەن گۆرنگ هەلدەبژیردریت بە سەرۆك پارلەمان و یەکەمین کار کە پارلەمان هەستا پێی ڕەزامەند بوونی ئەنجومەن بوو لەسەر لیبوردنیکی گشتی بۆ هەموو ئەندامە بەرهەلستکارەکانی ئەنجومەن و ئابلوقە دانی ئەنجومەن بوو لەلایەن پیاوانی بەرگی قاوەیی یەوە .

# پەیدابوونی جەستابو

گۆرنگ بڕیار دەدات کەمیك بحەویتەوە پاش هیلاکیەکی زۆر ، بۆ ئەم مەبەستە بەرەو ( ئیتالیا ) جاریکی تر دەکەویتە ری و چاوی بە (موسولینی) دەکەویت موسولینی بە گۆرنگ دەلیت ڕەزامەند نییە بەو پیلانە ( یاخییە / تگرفە ) ی کە حزبی نازی دەیکات دژ بە ( سامیە ) کە لە ئەلمانیادا سەری هەلداوە . پاش ئەوەی گۆرنگ لە ( ئیتالیا ) دەگەڕیتەوە بۆ ئەلمانیا دەبیتە سەرۆك وەزیرانی ( بلا روسیا ) دوای ئەوەی بە زۆر فون باین لا دەبریت لەو کارە .

لە (23) ی ئەپریلـــدا گۆرنـــگ نـــاویکی نـــوێ لە پۆلیســـی ئاسایشـــی (بـلا روسـیا) دەنیـت کە ( جەسـتابو ) بـوو پیتەکـانی سـەرەتای ئەم نـاوە مانـای ( پۆلیسی ئاسایشی نهینی دەولەت ) دەگەیەنیت .

ئەنجا گۆرنـگ هەستا بە دەولەمەنـدکردن و خۆشکردنی گوزەران و ژیـانی ئاسایی تایبەتی خۆی بۆ ئەم مەبەستە بووە خـاوەنی تەلاریکـی فراوان و دلگیر لە ( کیـردام ) کە لەو تەلارەدا ژوریکـی تـایبەتی وەك پەرستگایەك ڕازانـدبوەوە بـۆ یادی هاوسەرە لە ژین دەرچووەکەی (کارین) کە لە سنگی هۆلەکەشدا وینەیەکـی گەورەی کارینی هەلواسی بوو ژیانی بە سەلتی بەسـەر دەبردو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبـاری خـانوەکەی بەڕیـوەبەریکی تـایبەتی بـۆ ئەم مەبەسـتە دانـا کە نـاوی ( روبـرت کـروب ) بـوو پـاش مـاوەیەك پەیوەنـدی تونـد و تـۆل لەگەل ئەکتەریکـی ئەلمانی بە نـاوی ( ئیمس سونیمان ) دروست دەبیت کە بۆ یەکەمینجار گۆرنـگ لە سـاڵی ( 1932 ) دا بەرچـاوی کەوتبـوو تەمەنـی لە ( 30 ) سـاڵ تیـپەری کردبوو بیوەژن بوو بەڵام لە بواری شانۆدا پلەیەکی دیاریکراوی خۆی هەبوو لە دەولەتـدا ، لە سـاڵی 1935 دا شـوو دەکـات بە گۆرنـگ . شـایانی باسـە لەلای گۆرنـگ خۆشەویسـتی هاوسـەری یەکەم ( کـارین ) هەر بە زینـدویی مـابوەوە و خـانوەیەکی هـاوینەی کڕی و نـاوی نـا ( کـارین هۆل ) لەلایەکـی ترەوە خـاوەنی بارەگایەکی رەسمی بوو وەك سەرۆك وەزیرانـی ( بلاروسیا ) لە پاشـان کۆشکیك بـۆ خـۆی بنیـاد دەنیت لە سـاڵی 1933 دا لە نزیـك سـەرۆکایەتی ( جەسـتابو ) لە شـەقامی ( پـرنس ئەلبـرت ) ، گۆرنـگ لەنـاو خەلکیدا خۆشەویست بـوو چـونکە هەمیشـە دەیویست بە پیـاویکی لەخـۆ بـوردو و ریکوپیك و خـاوەن کەسیتی خـۆی پیشـان بـدات وا ڕاهـاتبوو کە لە یـادی رۆژی لەدایکبـوونی ئـاهەنگی فـراوان و گەورە ئەنجام بدات و خەلکی پیویستە دیاری بە نرخـی پیشکەش بکەن بە تـایبەت وینە هونەرییە بە نرخەکان .

گۆرنـــگ دەســـتی گرتبـــوو بەســـەر ریژەیەکـــی زۆر فـــراوان لە زەوی جەنگەلستان لە ( شکورفیلد ) لە باکوری بەرلین کە ( کوخیکی ) بچکۆلەی تیایدا دروست کردوو بەڵام وردەوردە بووە کۆشکیکی گەورەی هـاوینەی و نـاوی ژنـی یەکەمی لینا .

لە پاشـان خـانویەکی دیکەی لە چیاکـانی ( ئەلـب ) لە نزیـك بارەگـای تـایبەتی هـاوینەیی هتلـر بـۆ خـۆی دروستکرد لە ( ویبـرز ئەلـز بـرگ ) و لەسـەر پیـاوانی

پیشەسازی پیویست بوو کەم و کورپیەکانی تەواو بکەن بۆ ئەوەی پەیوەندیان لەگەل دەولەتدا پتەو بیت .

گۆرنگ زۆر قورس بوبو و کیشی لەشی زیادی کردبوو بە هۆی خۆشی باری ژیانی و ناتەواوی بەرنامەی خۆراکی کیشی لەشی بووبووە ( 280 ) کیلۆ زۆر حەزی لە خواردنی کیك و دروستکراوە هەویری و کریمدارەکان دەکرد زۆرجار کە هەستی بە برسیتی دەکرد لەفە و بیرەی دەخوارد شەو و رۆژ ، خەوی قول نەبوو بەیانیان زۆر بە زەحمەت لە خەو هەلدەستا ، هەروەها گۆرنگ ڕاهاتبوو بە ڕازاندنەوەی خۆی خیراخیرا نینۆکی کورت دەکردەوە و بە ( مانکی ر) چەوری دەکرد و (بۆدرە ) ی لە دەم و چاوی دەدا بە هۆی ( حەساسیەت ) دوای هەموو ریش تاشینیك و جل و بەرگی ژیرەوەی ( حەریر ) بوو بەلام جل و بەرگی یاسایی سەربازی و مەدەنی ئەوا زۆر حەزی لە لەبەرکردنی قاپوتی دریژ دەکرد کە بگاتە سەر زەوی هەر بۆیە سەرنجی دەوروبەری خۆی رادەکیشا . شەوانیش کاتیك دەنوست ( دشداشە ) ی حەریری لەبەر دەکرد و لە ژیانیدا قاتی بیجامای لەبەر نەکردووە .

گۆرنگ بەوە ناسرابوو کە هەر کاریك ئەنجام بدات زۆر بە چوست و چالاکی و وردی دەچووە سەر ئەو کارە . لە پاش ماوەیەك و لە سالی (1934 ) دا بەڕیوەبەریتی ( جەستابۆ ) و گرتوخانەکان و سەرکردایەتی هیزی پاسەوانی رەش دەسپیریت بە ( هنریش هملر ) و لە سالی ( 1934 ) دا لەسەر داوای هتلر هەموو کاروباریکی پۆلیس و ئاسایش سپیردرا بە ( هملر ) و بوە تاکە بەرپرس لە ئاسایشی هەموو ئەلمانیا .

* * *

# فڕۆکەوانی و ڕاوکردن

گۆرنگ لە سەرەتای ژیانیەوە گرنگی دایە هێزی ئاسمانی ئەلمانی کاتێك کە کـرا بە وەزیـری فرۆکەوانـی و لە مـایۆی ( 1933 ) دا کـرا بە وەزیـری گوێستنەوەی ئەلمانیای ئاسمانی و پروپاگەندە بڵاوبوەوە کە فرۆکە روسی یەکان لە ئاسمانی ئەلمانیادا هاتوچۆ دەکەن بەم هۆیەوە (ئینگلتەرە) بڕیاریدا هەندێک فڕۆکەی جەنگی بفرۆشیت بە ئەلمانیا بۆ بەکارهێنانی لەلایەن پۆلیسەوە .

ئەنجا گۆرنـگ هەستا بە کـۆکردنەوە و گفتوگـۆ کـردن لە وەزارەت لەگەل هاوڕێ کۆنەکانی خۆی وەك ( ئیرهارد میلش و ئەدۆلف گالاند ) کە یەکیك بوو لە مەشق پیکەرانی هێلی ئاسمانی ئەلمانی بازرگانی کە بە (لوفتهانزا) ناو دەبرا و لە ساڵی ( 1935 ) دا هێزی ئاسمانی ئەلمانی بە رەسمی بنیادنرا و بڕیکی زۆر لە فڕۆکەوانان ئامادەکرابون بۆ لیخوڕینی فڕۆکەی جەنگی کە بە نهینی لە روسیا و هەندێ وڵاتی تری بیانی لە ساڵانی رابردودا مەشقیان پی کراوە چونکە یەکیك لە مەرجەکانی پەیماننـامەی ( ڤێرسـای ) بریتـی بـوو لەوەی کە نابیت بە هیچ جۆریك ئەلمانیا مەشق بە فڕۆکەوانانی جەنگی بکات هەروەك نابیت خاوەن هێزی ئاسمانی بیت هەرچەنـدە ئەلمانیەکـان بە هـۆی فـرۆکە مەدەنیەکـان و فرۆکەی تاقیکاری و هەوایی لە نـاو ئەلمانیـدا بە بیـانوی وەرزشـەوە خەریکـی مەشقی خۆیان بوون .

لە پاشـان هتلـر گۆرنـگ دەکـات بە سـەرۆکی ڕاوچیـان کە پلـەیەك بـوو زۆر بەلای گـۆرنگەوە گرنـگ و خۆشەویسـت بـوو و گۆرنـگ بە هەمـوو توانـایەوە خـۆی دایە ئەم وەرزشــە و بـۆئەم مەبەسـتە جـل و بەرگــی تـایبەتی بـۆ بـۆنە و ئاهەنگە تایبەتەکان بە راوکردن ئامادە کردبوو شـایانی باسـە لە سـاڵی ( 1934 ) دا وەزارەتیکی تایبەت بەڕاو پیکهینرا .

هتلر هەرگیز خوی نەدەدایە راوکردن و کوشتنی باڵندە و گیانلەبەران بەڵکو تەواوی ئەم کارەی بۆ گۆرنگ جیهیشتبوو .

لە پاشان گۆرنـگ هەستا بەدەرکردنـی هەندێک یاسای تـایبەت بە راوەشکار کە تـاوەکو ئەمڕۆش لە ئەلمانیـادا پەیڕەوی دەکریت لەو یاسـایانە قەدەغە کردنـی نـانەوەی داو و وشـککردنی گیـانلەبەرانە ، بە زۆری گرنگیـدا بە بەخیـوکردن و ژیانـدنەوەی سـامانی ئـاژەل و پاراسـتنیان . گۆرنـگ خـۆی خـاوەن زەوی و زاریکـی کشـتوکالی بەرفـراوان بـوو کە فـراوانیەکەی خـۆی دەدا لە ( 100 ) هەزار دۆنم هەر لەو زەویانەدا بریکی زۆری ئـاژەل هەبوو ویڕای بوونی چەند

دەریاچە و دارستانیکی دلرفین . لە پاشان بووە خاوەن کوخیکی دیکەی تایبەت بە راو لە ( بلاروسیای رۆژهەڵات ) لە نزیك بارەگای هتلر .
لەلایەکی دیکەوە گرنگیدا بە کۆشکە هاوینەکەی کە بە ( کارین هۆل ) ناسراوبوو لەبەرەوە ناو بە ناو زەوی تر دەخاتە سەر زەوییەکانی و پشت بە ئەندازیارانی تایبەت بە بنیادنان دەبەستیت لەم کارەیدا بە جۆریك کە کاتی جەنگیش بەردەوام بوو لەم زەوی و زارانەدا . پاش ئەوەی بووە (مارشالی رایخ) هەستا بە دروستکردنی وینەیەکی گەورەی خۆی و لە سەر دەروازەی کۆشکەکەی هەلیواسی وینەکەشی گۆرنگ بەپیوە راوەستاوە ، ومشتی داوەتە ( خنجر ) یك . باخ و باخاتیکی زۆر ئەملاولای تەنیوە ، کۆشکەکەش لە دەرەوە بڕیکی زۆری لە پەیکەری جۆراوجۆری تیدا بوو ژورەکانی ناوەوەی کۆشکەکەشی بە وینە و دیمەنی هونەری جۆراوجۆر رازاندبووە و لە یەکیك لە ژورە فراوانەکانی کۆشکەکەشدا هیلیکی ئاسنی بە شەمەندەفەر و تەواوی پیویستیەکانیەوە دروست کردبوو بۆ ئەوەی وەك مندالیکی گەورە لە کاتە بەتالەکانیدا یاریان پی بکات .
لە وڵاتی سوید کاتیك کە خەلکی ئەو ( خاچە لاشکاوە ) یان لەسەر گۆڕی ژنەکەی لابرد کە بە هیماو ئارمی نازی ناسراوە کە کاتی خۆی گۆرنگ دایناوبوو وەك ناڕازی بوونیك بەرامبەر بە سیاسەتی ئەلمانیای نازی ، گۆرنگ هەستا بە دروستکردنی گۆرستانیك لە ناو باخچەی کۆشکەکەی لە نزیك یەکیك لە دەریاچەکانەوە و هەموو ( زەخرەفە ) و دروستکراوەکانی سەر گۆرەکەی لە ( سوید ) ەوە گوێستەوە بۆ ئەلمانیا و بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ژمارەیەکی زۆر لە ( دبلۆماسی ) و پیاوانی کاربەدەستی بانگهیشت کردبوو لەناو ئامادەبواندا هتلر یەکیك بوو لەوان ، هەرچەندە تەرمی ژنەکەی رۆژی ( 19 ) یونیوی ( 1934 ) گەیشتبووە جی و بە یەکیك لەو جل و بەرگە تایبەتانەوە کە یەکیك لەو پلانەی نیشاندەدا کە لە دەولەتەدا خاوەنی بوو پیشوازی لە میوانەکانی کرد .

# پیاوانی گەورەی ئەڵمانیای نازی و ( رۆهم )

لە ساڵی ( 1934 ) دا ( گۆرنگ و هملر ) گرنگترین کەسایەتی بوون لە ئەلمانیادا دوای هتلر بەدوایاندا ( گۆبلز ) دیت وەزیری پروپاگەندە ، ئەنجا ( هنریش هملر ) کە بە خیرایی بە پلەکاندا سەر دەکەویت ، پیاوان و ئەوانەی کە لە هتلرەوە نزیك بوون هەموو لە هەوڵی ڕەزامەند بوون و خۆشی سەرکردەدا بوون هتلریش بە بەرامبەر پیویستی و هەلومەرجی تەواوی دەخستە بەردەم ، ئەو پیاوانە بۆ ئەوەی کەسیان بیر لە جیگەی نەکەنەوە و هەوڵی لەسەر حوکم لابردنی بدەن جگە لە (روهم) نەبیت کە بوبووە سەرکردەی سوپای پیاوانی بەرگی قاوەیی کە بڕوایان وایە بە هەوڵ و هیمەتی ئەوان هتلر بەو پلەو پایەیە گەیشتووە و ئەوان گەیاندویانەتە سەردەسەلات هەر بۆیە ئەم سوپاو کۆمەلە بوبووە مایەی نیگەرانی و مەترسی هتلر روهمیش ئاواتە خواز بوو کە ببیت بە وەزیری جەنگ و ئەو تیپە حزبیە کە پیاوانی بەرگی قاوەیین لەگەل سوپادا لیکیان بدات و سوپایەکی شۆرشگیری نوێ لەسەر یاسا و ڕینمایی نوێ دروست بکات .

هتلر لە دیسمبەری ( 1933 ) دا ( روهم ) دەکات بە وەزیر و هەست بە مەترسی دەکات و دەیەویت لە ناوی بەریت لە پاشان هتلر بڕیار دەدات لە لیدانیکی بە کۆمەل و کتوپڕدا روهم و ئەوانەی لە دژی ئەون لەناو بەریت .

لە شەوی ( 30 ) یونیودا لە ساڵی ( 1934 ) دا قەسابخانەیەك دروست بوو کە تیایدا زیاتر لە ( 600 ) کەس لە سەرکردەکانی بەرگی قاوەیی کوژران لە ناویاندا ( روهم و جەنەرال فون شلنجر ) و سەرکردە (فون بردو و جولیوس شتراسر ) هەبوون ئەم پاکسازییە لە هەموو ئەلمانیادا ئەنجامدراو لە ( بەرلین ) گۆرنگ ئەنجامدەری ئەم ئەرکە بوو کاتیك کە هاواری دەکرد بیانکوژن لە ناویان بەرن .

شایانی باسە گوبلزی وەزیری پروپاگەندە بە بیانوی ئەوەی کە ئەمانە دلسۆزی ( فوهرر ) نەبوون پاساوی بۆ گەلی ئەلمانیا دەهینایەوە سەبارەت

بەئەنجامدانی ئەم کارە . کاتێك کە ( هند نبرگ ) دەمریت هتلر دەبیتە سەرۆکی دەولەت لەگەل سەرۆکی وەزیران و پیاوانی بەرگی قاوەیی سویندی دلسۆزی بۆ خودی هتلر دەخۆن لە جیاتی سویند خواردن بۆ دەولەت یاخود ( دەستور ) .

گۆرنگ هەرگیز خۆی بە توندڕە و نەدەزانی بەرامبەر بە دژایەتی کردنی ( سامیەت ) و بەرهەلستی کردنی ( یەهود ) بەڵام ناچاربوو بەم کارە رازی بیت لە پیناو مانەوە و لەدەستنەدانی جی و ریی ( هیس ) کە جیگری ( فوهرر ) بوو لە حزبدا و کرابووە وەزیر لە دەولەتدا هەروەك خۆی مایەوە پاش ئەوەی کە هتلریش دەچیتە سەرحوکم ئەمەش وای کردبوو گۆرنگ بە زۆری دەزانی چونکە گۆرنگ خۆی بە دووەم کەس دەزانی دوای هتلر هەر بۆیە ویستی پلەیەك یاخود نازناویکی لەلایەن هتلرەوە پآ بدریت ، بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی ، بەڵام هتلر کارەکەی وەك خۆی هیشتەوە .

لە تەمنی ( 42 ) ساڵیدا گۆرنگ بڕیاریدا پەیوەندی لەگەل ( ئیمس سونیمان ) دا لەسەر بناغەی ( شەرعی ) دابمەزریت و لە ( 10 ) ی ئەپریلی ( 1935 ) دا ئیمسی بە رەسمی لە ئاهەنگیکی گەورەدا کردە هاوسەری خۆی و هتلر ئامادەیی مەراسیمی هینانەکە بوو لە ( کەنیسە ) کاتیك قەشەیەکی نازی بە ناوی ( لویدج سۆلەر ) گۆرنگ و ئیمس لەیەك مارە دەبڕی لە مەراسیمیکی ئاینیدا و لە ئیوارەدا ئاهەنگیکی گەورە لە تەلاری ( ئۆپیرا ) سازکرا و شەقامەکانی ( بەرلین ) رازایەوە بەو بۆنەیەو و هیزی فرۆکەوانی ئاسمانی بە فڕین بەسەر ئەو شارەدا بەشداری ئەم بۆنەیەیان کرد و ئامادەبوان دیاری گرنگ و بە نرخی خۆیان پیشکەش بە زاوا کرد .

پاش ئەوەی گۆرنگ هیزی ئاسمانی ئەلمانیا دەژینیتەوە و جیگیری دەکات گرنگی دەدات بە بواری سیاسەتی دەرەوە و مەیدانی ئابوری .

لە ساڵەکانی ( 1935 بۆ 1939 ) گۆرنگ بە ئەرکی خۆی هەلدەستیت کە جیبەجآ کردنی سیاسەتی هتلرە بە مەبەستی کۆکردنەوە و یەك بوونی ئەلمانیا لە یەك دەولەتدا .

لە پاش ئەوەی هتلر بە سەرباز بوون دەکات بە زۆر ( التجنيد ألآجباري ) لە ساڵی ( 1935 ) دا هەر لەو ساڵەدا زەوی و زارەکانی ناوچەی ( رین ) داگیر دەکات لە پاشان ڕاپرسیەك لە هەریمی ( سار ) ئەنجام دەدریت لە هەمان ساڵدا کە دەبیتە هۆی گەڕانەوەی ئەو هەریمە بۆ ئەلمانیا .

ئەنجا ئەلمانیا ڕێکەوتن نامەیەك لەگەل بەریتانیاکاندا مۆر دەکات کە ڕێ دەدات ئەلمانیا هیزی ( ئوستۆل ) ە دەریاییەکان لە ( 35% ) زیاد بکات بەرامبەر هیزە بەریتانیەکان .

هتلر سوربوو لەسەر گێڕانەوەی ئەو زەویانەی کە بە ( سویدت ) ناسراوە و کەوتۆتە ( چیك و سلۆفاکیا ) وە لەگەل داگیرکردنی ( نەمسا ) بەڵام هتلر ئەنجامدانی ئەم کارەی دوا خست تاوەکو سوپا بە تەواوی پڕچەك دەبن وە بۆ ئەوەی ترسی دراوسێ و ( پۆلەندیەکان ) بڕەویتەوە گۆرنگی لەم ئەرکە بەرپرس کرد کە تیایدا سەرکەوتنی بەدەست هینا چونکە گۆرنگ بەهۆی ئەو ئاهەنگانەی کە بەبۆنەی ڕاوەوە بانگهیشت دەکرا سەرکردە و کاربەدەستانی لە نیازپاکی هتلر ئاگادار دەکردەوە بۆ زیاتر دلنیا بوونیان گۆرنگ پەیماننامەی هاوکاری پاراستنی لەگەل هەر کەس و لایەکدا مۆر دەکرد گەر بیانویستایە .

# تەقەمەنی لە جیاتی پەنیر

کاتیك کە جەنگی ئەهلی لە ( ئیسپانیا ) لە نیوان هیزەکانی ( فرانکۆ ) و حکومەتی ( مدرید ) بەرپا دەبیت فرانکۆ داوای یارمەتی لە هتلر دەکات و هتلریش بە خیرایی داواکەی جێبەجێ دەکات و گۆرنگ داوا لە پیاوانی فرۆکەوانی ئەلمانیا دەکات بچن بۆ ( ئەفریقیا ) بۆ هاوکاری کردنی (فرانکۆ) کە ئەمە باشترین هەلە بۆ تاقیکردنەوەی هاوکاری توانای هیزی ئاسمانی جەنگی ئەلمانیا لە جەنگیکی راستەقینەدا ، بەم پێیە ئەلمانیەکان شاری ( جرنیکا ) یان ویرانکرد وەك سەرەتایەك بۆ ویرانکردنی (وارسۆ و رۆتردام) دوای ( 3 ) ساڵ لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا

لە رووی ئابوریشەوە هتلر ( هلمار شاخت ) ی بەرپرس کرد بۆ ئەوەی ئەلمانیا رابگیریت لەسەر بنچینەی ئابوری جەنگی و پیشەسازی ئەلمانیا بەرهەمی سەربازی ئامادە بکات ، ئەمە ئەو سیاسەتە بوو کە گۆرنگ ناوینا ( تەقەمەنی لە جیاتی پەنیر ) کاتیك کە لە وتاریکیدا دەلیت : ( پەنیر و خواردن چیمان لی دەکات چ سودیکی هەیە جگە لە قەلەوی ) بۆ ئەم مەبەستە وەك گالتەجاڕیەك دەست دەدات بە ورگی خۆیدا و بە نمونە دەیهینیتەوە کە ئەنجامەکەی دەبیتە گەشکە گرتن و پیکەنینی ئامادەبوان و هەموو بە یەك دەنگ هاوار دەکەن ( گۆرنگ پیریکی خۆشەویست ) و دەست دەکەن بەچەپلە لیدان .

( شاخت ) توانی جوامیرانە ئەرکی ڕاگرتنی ئەلمانیا لە ڕوی ئابوریەوە ڕابگریت و کەل و پەلی تەواو بۆ جەنگ ئامادە بکات ئەویش بە هۆی هینانی کەرەستەی خاو و کەل و پەلی سەرەتایی لە دەرەوە و ناوەوەی ئەلمانیا .

لە ساڵی 1936 دا هتلر گۆرنگ بەر پرس دەکات لە سەرپەرشتی پارە و سیولە بیانیەکان و هینانی بابەتە سەرەتاییەکانی پیویست بە پرۆگرامی پڕچەك کردن لە پاشان پڕۆژەیەکی چوار ساڵی خستە بەر دەست ، مەبەست لەم پرۆژەیە ڕیکخستنی ئابوری ئەلمانیا بوو کە گۆڕنگ وەك وەزیریك بۆ سەرپەرشتی ئەم پیلانە دامەزراو دەستنیشان کرا گۆرنگیش بەم پلە نوێیە زۆر خۆشحاڵا بوو چونکە ئەو یادەی هەر لە بیر بوو کە کاتی خۆی باپیرە گەورەی بەڕیوەبەری خەرجی ( فریدریکی گەورە ) بوو بوو ، ئەم دامەزراندن ودەستنیشان کردنەی گۆرنگ لەلایەن هتلرەوە بە بێ ئاگاداری شاخت بوو کە زیاتر گۆرنگی دڵا خۆش کردبوو .

پەیڕەوکردنــی ئەم کــارە وەك سیاســەتیك کەبە ( فـرق تسـد ) ناســراو بــوو لەلایەن هتلرەوە پیادە دەکرا لە دژی هەموو بەرهەلستکارانی .
گۆرنیگش لای خۆیەوە دەبوە ڕیگرو قورس کردنـی هەمـوو جۆرە کـار و باریك لەبەردەم شاخت .
خۆشەویستی گۆرنـگ لەنـاو کـۆمەڵا و گەلـی ئەلمانیـادا وەك ئەلمـانیەك کە ئــارەزوی زۆری خــواردن و خــواردنەوە دەکــات و لە هەمانکاتیشــدا حەزی لە گـالتەکردن و گەمەی سـەر پێییە ئەم هۆکـارانەی گۆرنـگ لەنـاو خەلکیدا بوبـووە ڕۆح سـوککردنی لە نـاو جەمـاوەردا و کاتیـك کە داوای لە گەلـی ئەلمانیـا کـرد بەشداری و هاوبەشـی بکەن هەر کەسێ لای خۆیە بۆ دروستکردن و بنیادنـانی کـارگە و کارخـانەی سـەربازی خەلکـی بە (ئەلـقە و مستیلەی) تـاییەت بە ژیانی هاوسـەریتی خۆیـان پیشکەش کرد لەو پیناوەدا بەم جۆرە شـاخت و بوونی هـیچ کـاڕێگەریەکی نەبـوو لە ئاکامـدا دەسـتی لە کـار کیشـایەوە و مەیـدانی بـۆ گۆرنـگ چۆلکرد هتلـر زۆر هەولێـدا ( شـاخت ) لە پۆستەکەی بمینیتەوە بەڵام شــاخت لە نـۆڤە مـبەری 1937 دا وەزارەتــی جــآ هیشــت . گۆرنــگ دەبیـتە ( نیردراو / سفیر ) ی هتلر بۆ گفتوگۆ و وتـویژکردن لەگەڵ ( موسولینی ) چونکە تەرازوی سەنتەری سیاسی زۆر ڕەق بوو بوو بەرامبەر ( ئیتالیـا ) بە هۆیئەوەی کە ئیتالیــا دەخــالەتی جەنگــی ئەهلــی ( ئیســپانیا ) ی کردبــوو ویــڕای بــوونی پەیماننامەیەك لە نیوان ئەو دوو دەولەتەدا کە هاتوچۆی سەربەست دەکرد لەنـاو دەریای سپی ناوەڕاستدا ، لەو کاتەشدا ئیتالیا نیگەران بوو بە هۆی ئەو پچڕان و دوور کەوتنەوەیە کە بە سەریدا درابوو لەلایەن وڵاتـانی دراوسیوە لەسـەر داوای نەتەوە یەککگرتووەکــان لە تـۆلەی داگیـر کردنــی (حەبەشــە) لەلایەن ئیتالیــاوە ، ئیتالیـاش لای خـۆیەوە نـاڕازی بـوو بەرامـبەر بە لکانـدنی وڵاتــی ( نەمسـا ) بە ئەلمانیـاوە و گۆرنـگ بـۆ ئەم مەبەسـتە لە سـاڵی 1937 دا دوو جـار چـاوی بە موسولینی دەکەویت و پێـی ڕادەگەیەنیت کە ( نەمسا بوار / مجال حیوی ) یکـی بژیوی دەگەیەنیت بە ئەلمانیا .
بەڵام پەیوەنـدیەکانی گۆرنـگ لەگەڵ کاربەدەستانی بەریتانیـادا سـەرکەوتوو نەبـوو وەك ئیتالیـا هەرچەنـدە گۆرنـگ ویسـتی ئامـادەی (تـاج لەسـەرنانی جۆرج پاشــای شەشــەم) بیـت لە ســاڵی 1937 دا وەك نـوینەری حکـومەتی ئەلمانیـا لە

ئەنجامدا هەلایەکی گەورە بەرپاکرا لەلایەن ئەنجومەنی ( عموم ) ی بەریتانیاوە کە نایەویت پیلاوی خویناوی ئەم پیاوە بە خوینی بیتاوانان بچیتە وڵاتەکەیانەوە .

لە پاشان ( فۆن و ینتروب ) ی بالیوزی ئەلمانیا لە ( لەندەن ) داوای لە حکومەتەکەی کرد کە ئەلمانیا نوینەریکی جگە لە گۆرنگ بنیریت و ئەلمانیاش هەستا بە ناردنی جەنراڵ ( بلومبرگ ) لە جیاتی گۆرنگ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گۆرنگ هەستا بە سەردان بۆ ( ئینگلتەرا ) و لە بالیوزخانە داوایان لە گۆرنگ کرد کە سەر بەرز نەکاتەوە لە دەرەوەی بارەگای بالیوزخانە و پیش ئەوەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن پێی بزانن بگەریتەوە بۆ ئەلمانیا .

گۆرنگ لە کۆشکەکەی خۆشی لە کارین هول پیشوازی لە میوانە بەریتانیەکانی کرد لە ئاهەنگیکی گەورەدا و لە پیشەوەی ئامادەبووندا (دۆق و دۆقە وندسور ) هەبون کە دۆق وندسۆر بریتی بوو لە ( پاشا ئەدواردی هەشتەم ) پاشای بەریتانیا بوو بوو لە ڕابردودا هەروەها لە ناو میوانەکاندا ( لۆرد لندندری ) و بالیۆزی بەریتانی ( نیفل هندرس ) و بالیوزی ئەمریکا ( ویلیام رود ) و بالیوزی فەڕەنسا ( ئەندریە فرانسوا بونسبی ) ئامادە بوبوون .

شایانی باسە کە پیاوانی بواری دبلۆماسی لەناو هەموو نازیەکاندا گۆرنگیان بە باشترین کەسایەتی دادەنا بۆ ڕاویژکردن و بیروڕا گۆڕینەوە و گۆرنگیش جوامیرانە لەم بوارەدا ئەرکی خۆی بینی ، توانیبوی ترس و دودلی هەمووان بڕەوینیتەوە ـــ سەبارەت بە چاوچنۆکی و دەستدریژی ئەلمانیا کە ئەم کارەی گۆرنگ تەواو مەبەستی هتلری نیشاندەدا بنیادنرا بوو لەسەر ( درۆ و دەست بڕین ) .

هەروەها لۆرد ( هالیفاکس ) سەردانی گۆرنگی دەکرد کە لە پاشان بوبووە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا و گۆرنگ پێی ڕاگەیاندبوو کە ئەلمانیا هیچ نیەتیکی نییە دەربارەی بەرپا کردنی جەنگ ، ئەمە لە کاتیدا کە هتلر خۆی کۆ دەکردەوە بۆ ئەوەی لە سەرەتاکانی ساڵی 1940 دا و پاش ئەوەی تەواو ئەلمانیا لە ڕووی سەربازیەوە ئامادە بیت هەلئایسانی جەنگ ڕابگەیەنیت .

گۆرنگ بە هۆی پەیمان و بەلیننامەوە و قسە بریقەدارەکانی وای لە هەردوو دەولتی ( فەرەنسا و نەمسا ) کرد کە نەترسن و هیچ خۆ ئامادە نەکەن بۆ ئەگەری شەڕ لەگەل ئەلمانیادا ، هەروەها گۆرنگ توانیبوی بەریتانیەکان بە

هەمان هەلەدا بەریت تەنها چەند کەسانیکی کەم نەبیت لە نمونەی ( وینستون چرچڵ ) .
لە هەمانکاتدا لەسەر گۆرنگ پیویست بوو کە بە خیرایی ـــ ئەلمانیا پڕچەك بکات وەك سەرپەرشتکاری ئابوری ئەلمانیا . هەر لەم پیناوەدا گۆرنگ بە شیوەیەکی قوڵا و سامناك دەخالەتی دەکرد لە کارو باری پیشەسازیدا و هەستا بە کەمکردنەوەی وەدەست هبنان و بەستن و ڕاگرتنی نرخ و قانزانجەکان کە بڕیار وابوو دابەش بکریت بەسەر ئەو پیشەسازیانەی پیویستیان بە دەستی کارکەر هەیە و لە پاشان سەندیکای کریکارانی هەلوە شاندەوە و لە جیگەی سندوقی پیشتیوانی حزبی نازی دامەزراند تا کۆمەك و پیتاك کۆ بکاتەوە بۆ حکومەت . پاش ماوەیەك پروپاگەندە بلاو بۆوە لە ( بەرلین ) کە گوێیا گۆرنگ گەڕاوەتەوە سەر خواردن و وەرگرتنی بابەتە بآ هۆش بەرەکان ئەویش لە ئەنجامی ئەو نەهامەتیانەی کە لە ڕابردوودا بە سەری هاتووە لە نیوان ساڵانی 1931 بۆ 1933 و پرۆفیسۆر ( هوبرت کاهل ) ئەرکی چارەسەری گۆرنگی گرتبووە ئەستۆ لە نەخۆشخانە تایبەتەکەی خۆی لە نزیك شاری ( کۆلۆن ) ، گۆرنگ تاوەکو لە تەمەندا بەرەو پیش بچوایە زیاتر حەزی بە سەرکردایەتی و خۆ بە زل زانین دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا زۆر حەزی لە کۆکردنەوەی خشلا و زیڕی گرانبەها دەکرد نەك بۆ فرۆشتن بەلکو بۆ سەیر کردن و یاری کردن پێیان .
ئەم هۆکارانە و زۆر هۆکاری تایبەتی تر گۆرنگی والیکردبوو ئەرك و فرمانەکانی پشتگوێ بخات کە کاڕێگەری خۆی هەبوو لە دۆڕاندن و شکاندنی ئەلمانیادا .

* * *

بەشی چوارەم

# جەنگ یان ئاشتی

لە ساڵی 1938 دا کات بە پەلە تیدەپەڕی و ( فۆن بلومبرگ ) وەزیری جەنگ بوو و تەمەنی ( 60 ) ساڵ بوو و هەمیشە نارازی بوو بەرامبەر بە چوونە ناو جەنگی ئەلمانیا دژی ڕوسیا و بەم پێیە لەگەڵ ویست و خواستەکانی هتلری سەرکردەدا نەدەجوولا و بەرێگر دەژمیردرا لەبەردەم هتلردا . هتلر نەیدەویست ڕاستەوخۆ ( بلومبرگ ) لە دەسەڵات دور بخاتەوە بە هۆی کارێگەری لەسەر سوپا . بەڵام هەلیکی زۆرچاك هاتە پیش بۆئەوەی هتلر بلومبرگ لە دەسەڵات دور بخاتەوە و ڕیگە ئاوەلا بیت بۆ هەلگیرساندنی جەنگ ، ئەو هەلەش ئەوە بوو کاتیك کە فۆن بلومبرگ دلی دەچیت بە کچە شۆخیکدا بەڵام لە تەمەندا زۆر لەو بچوکترە وە ئەم سکالایەی لەلای گۆرنگ دەدرکینیت بە هیوای ڕیگە چارە دۆزینەوە و گۆرنگیش چاوی بڕیبوە ئەو پلە و پایەیەی کە بلومبرگ هەیبوو دەیویست لیی داگیر بکات و ببیت بە سەرکردەی گشت هیزی چەکدار و وەزیری جەنگ و کاتیك کە بلومبرگ باس لە هینانی ئەو کچە دەکات گۆرنگ زۆر بە گەرمی پشتیوانی دەکات و گفتی ئامادە بوونی خۆی و هتلری پێ دەدات وەك ( شاهد ) لە کاتی مارەبڕیدا و لە ڕۆژی ( 12 ) ی ینایری 1938 دا بلومبرگ هاوسەری خۆی لە ئاهەنگیکی گەورەدا دیاری دەکات و گۆرنگیش بەلینەکەی بەسەر دەبات و ( بوك و زاوا ) بەرە و

دەریاچەی ( کایدی ) بەڕێ دەکەون بۆ بەسەر بردی وەك دەڵین مانگیگ لە هەنگوین ژین بەسەربردن .

بۆ ڕۆژی دوایی بەڕیوەبەری پۆلیسی ( بەرلین ) دۆسیەیەکیچڕوپڕ دەخاتە بەردەم گۆرنگ لە ڕیگەی ( کیتل ) ەوە و لەبەر گرنگی باسەکەش ئەوەبوو کە بەپآی ئەو زانیاریانەی لەو دۆسیەیەدا بوون هاوسەر واتە ژنی وەزیریجەنگ ــ میژوویەکی کۆنی هەیە لە بەد ڕەوشتیدا و ئەم هۆیە بوە ئەنجامی ڵادانی ( فۆن بلومبرگ ) لەسەر دەسەڵات لە لایەن هتلرەوە و بە پاڵپشتی ئەو دۆسیەیە . هەندێک سەرچاوە دەڵین پیشتر گۆرنگ ئاگاداری ئەم ڕووداوە بوە بەڵام گوێی لی خەواندووە بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە وەك چەکیك لە دژی بلومبرگ بەکار بهینیت بۆئەوەی لەسەر کار لاببریت و خۆی و هتلر بە ئاواتەکانی خۆیان بگەن ، پاش لەناو بردن و لا بردنی بلومبرگ بەپآی یاسا یەکیکی دی لە جیگەی دانرا کە کۆلونیل جەنەراڵ ( فون فریش ) بوو بەڵام بەو پێیەی کە ئەم جەنەڕالەش وەك پیش خۆی دژی بەکارهینانی هیزە هتلر بڕیاری لابردنی ئەویشی دا لەسەر کار ، ئەم ئەرکەی بە ( هملر ) و پیاوان ( جەستابو ) سپارد ئەوانیش جوامیرانە بەم کارە هەڵدەسن و لە ( 26 ) ی ینایردا ئەم دەزگایە ڕایگەیاند کە سەرکردەی هیزی چەکدار تووشی حەزکردن بە کاری بەد ڕەوشتی و لادان ( إنحراف جنسی ) دەکات و بۆ ئەم مەستە و بۆ سەلماندنی (شاهد) ە کەش کابرایەکی بەد ڕەوشتی بآ کەلك بوو بە ناوی ( شمیدت ) کە وتی هەندێک پارەی لە سەرکردەی گشتی هیزی چەکدار لەم پیناوەدا وەرگرتوە ، هەرچەندە ( فون فریش ) ئەم تۆمەتەی بە گاڵتەجاڕ و درۆ لە قەڵەمدا بەڵام لە ئەنجامدا لەسەر کار ڵابرا لە پاشان ساغ بوونەوەی نادروستی ئەم تۆمەتە ڕوون بوەوە لەدادگادا بەڵام پاش وەك دەڵین ( باران کەپنەك ) .

گۆرنگ چاوەڕوان بوو لە لایەن هتلرەوە ئەم پلەیەی پیببەخشریت بەڵام هتلر ئەم پلەیەی بۆ خۆی هەڵگرت و پاش ئەوەی کە ئەنجوومەنی وەزیران کۆبوەوە و گۆرنگیش ئامادەبوو پآی ڕاگەیاندن کە لەمڕۆ بە دواوە خۆی پلەی سەرکردایەتی گشتی هیزی چەکدار دەکات لە پاڵا سەرکردایەتی باڵا وەك سەرۆکی دەولەت و وەزارەتی جەنگی هەلوەشاندەوە و ( 16 ) جەنەڕالی لەسەر کار ڵابردو لە جیگەی ( فۆن فریش ) جەنەراڵ ( فۆن فریشتش ) ی دانا کە زۆر نەدوو بوو و بە ئاسانی ئیش و کاری پێ ئەنجامدەدرا لە هەمانکاتیشدا بۆ ئەوەی

دلی گۆرنگ ڕابگریت پلەی ( ئەلفیلد مارشاڵ ) ی پێ بەخشی لە ئالوگۆڕ کردنیکی تردا هتلر دوا وەزیری لە کۆنەکان کە ساڵی 1933 درا بوو بەسەریدا لادا و ( بارون فۆن رینتروب ) ی دامەزراند .

ئەنجا باسی خستنە سەری وڵاتی ( نەمسا ) بۆسەر ئەلمانیا هاتە پیش و گۆرنگ لەم بوارەدا ئەرکی گرنگی بینی . چونکە ( نەمسا ) لەسەر پەتەکە بوو خەریك بوو دەکەوت ، کاتی خۆی ( فۆن باین ) کە بالیوزی ئەلمانیا بوو لە ( نەمسا ) ساڵی 1936 داوای کردبوو لە حکومەتی نەمسا کە مافی نازییەکان بدات بۆ ئەوەی چالاکی سیاسی ئاسای خۆیان ئەنجام بدەن پاش ئەوەی کە ئەم چالاکیە لە نازییەکان قەدەغەکرابوو لەو وڵاتەدا بەهۆی تیرۆرکردنی ڕاویژکار ( دلفوسی ) هوە هەرچەندە ڕاویژکاری نوێ کە ( کیرت فون شوشنگ ) بوو هەوڵی زۆریدا کە ( موسولینی ) قایل بکات دژی دەستدریژی و زولم و زۆری هتلر بوەستیت ، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە گۆرنگ زۆر لەگەڵ ( موسولینی ) دا تیکەڵ بوو ئەم هەوڵە سەری نەگرت . لە پاشان شوشنگ ناچار بوو کە بە هاوکاری وەزیری دەرەوەی وڵاتەکەی کە ناوی ( جید و شمیدت ) بوو لە ( 11 ) ی فبرایردا سەردانی هتلر بکات لە بارەگای تایبەتی خۆی لە ( برگهوف ) لەم چاوپیکەوتنەدا هتلر داوای لە ( شوشنگ ) کرد ( سامی ئەنکوارت ) بکریتە وەزیری ناوخۆی نەمسا کە پیشەی پاریزەرە و بە ڕەچەلەك نەمساوییە و سەرکردەی نازییەکانی ناو وڵاتی نەمسایە و ماوەی ( 7 ) ڕۆژی دانا بۆ بیرکردنەوەی و جێبەجێ کردنی ئەم داوایە . لە ( 16 ) ی فبرایردا شوشنگ داواکاریەکەی هتلری جێبەجێ کردوو ( ئەنکوارت) ی کردە وەزیری ناوخۆی ( نەمسا ) بەو هیوایەی نەمسا بەسەربەخۆی بمینیتەوە هەر بۆئەم مەبەستە شوشنگ بڕیاریدا لە ( 12 ) ی مارسدا دەنگدانیکی گشتی لە هەموو نەمسادا ئەنجام بدریت بە ( ئا یا نەخێر ) ی چوونە سەر ئەلمانیای وڵاتەکەیان ، بەڵام پاش ئەوەی هتلر لە ئاکامیئەم دەنگدانە دەترسا گەر بیت و گەلی نەمسا بڕیاری دوور کەوتنەوە بدەن لە ئەلمانیا ئەوا هیتلر بیانوی نامینیت لە بەردەم ڕای گشتی جیهانیدا بۆ داگیرکردنی نەمسا هەر بۆیە بە پەلە رۆژی ( 9 ) ی مارس پیش ئەنجامدانی دەنگدانەکە هتلر داوای لە سوپا کرد خۆی ئامادە بکات بۆ داگیرکردنی نەمسا لە رۆژی ( 12 ) ی مارسدا . لە هەمانکاتدا بە نوسراویك (مۆسولینی ) دلنیا کردەوە لە پاراستنی سنوری ئیتالیا لە هەر دەستدریژیەك کە

بكريته سەرى . له رۆژى ( 11 ) ى مارسدا به نوسراويك شوشنگى ئاگادار كرد كه هەموو جۆره هەلويستيك و كاريك كه پەيوەندى به دەنگدانەوه هەيه ڕابگريت ئەنجا سوپايەكى زۆر لەسەر سنورى ( پاڤاريا – نەمسا ) كۆكرايەوه و فرۆكەكانى سوپاى ئەلمانيا دەستيان كرد به هاتوچۆكردن به ئاسمانى ناوچەكەدا له پاشان گۆرنگ دەستى به گفتوگۆ و وتويژ كرد لەگەڵ شوشنگ هەروەها لەگەڵ سەرۆكى وڵاتى نەمسا ( ميگلاس ) به تەلەفۆن ( 27 ) پەيوەندى ئەنجامدا و له هەموو وتويژەكاندا گۆرنگ داواى له سەرۆكى نەمسا كردبوو كه شوشنگ لەسەر كار لا ببات و له جيگەى ئەنكورات دابنيت له حكومەتيكى سۆسياليستدا واته نازيدا له كاتيكدا كه خەريك بوو ئەنكورات له دەسەڵاتى حكومەتى نەمسادا كارەكانى دەگرته دەست , بروسكەيەكى نارد بۆ هيتلر كه با هيزه چەكدارەكانى ئەلمانيا دەخالەت بكات له پاراستنى دەسەڵات له نەمسادا . هتلر له رۆژى ( 14 ) ى مارسدا چووه ناو ( ڤييەنا ) ى پايتەخت پاش ئەوەى كه هملر هيمنى بارودۆخى شارى به هتلر ڕاگەياندبوو هەرچەنده ( 300 ) يەهودى لەو شارەدا بوو و هەموو ئەوانەى كه گومانيان ليكراوه گيراون . شايانى باسه هەموو دەولەتانى رۆژئاوا لەم كارەى هتلر دەستەوەسان بوون و هيچ شتيكيان له دژى ئەم كاره بۆ نەكرا .

* * *

# خەونەکانی هتلر و ڕاوەدوونانی یەهود

لە پاش داگیرکردنی ( نەمسا ) هتلر دەیویست دەست بگریت بەسەر زەویەکانی ( سویدت ) کە بە پێی پەیماننامەی ( ڤرسای ) ئەو زەویانە خرابووە سەر دەوڵەتی ( چیك و سلۆڤاکیا ) کە دانیشتوانی بە ڕەچەڵەك ئەلمانین . هتلر چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەی سپارد بە ( رۆدۆلف هیس ) کە لەگەڵ سەرکردە نازیەکان ئەو زەویانە چارەسەر بکات کە ( کونراد هنلی ) بوو . بەڵام گۆرنگ سەرقالی چارەسەری باری ئابوری وڵات بوو هەر لەو پیناوەدا لە کۆبونەوەیەکیدا لەگەڵ سەرجەم پیاوانی پیشەسازیدا رایگەیاند گەربیت و کەرەستەو بابەتی تەواوی پیویست بەرهەم نەهینن ئەوا هەڵدەستیت بەخۆمالیکردنی هەموو کارگە و کارخانەکان , هەروەها داوای کرد کاتژمیرەکانی کارکردن زیاد بکریت و گەر پیویستی کرد با ژنانیش کار بکەن گەر نا ئەوا بە زۆر کاریان پیدەکریت .

ئەنجا دیتە سەر یەهود و سیاسەت و یاسا نابەجیکانی ( نۆرمبرگ ) کە لە ساڵی ( 1935 ) دا ردانراوە جێبەجێ دەکات کە بریتی بوو لە بەستن و دەست بەسەراگرتنی سامانەکانیان هەروەها قەدەغەکردنی هاوبەشی کردنیان لە بزاڤی پیشەسازیدا و هانی دەدان کۆچ بکەن و خاکی ئەلمانیا جآ بهیلن . لە ساڵی 1938 دا هەموو مال و سامانەکانی یەهود ناونوس کرا لە دەولەتدا بەڵام کاتیك کە ( گۆبلز ) خۆپیشاندانیك ئەنجامدەدا لە (10) ی نۆڤەمبەری 1938 دا لە دژی لەسەر کار لابردنی کارمەندیك لە بالیۆزخانەی ئەلمانیا لە ( پاریس ) بەدەستی گەنجیکی یەهودی زەرەر و زیانیکی زۆر لەوخۆپیشاندانەدا بە کۆگا و گەنجینە ئابورییەکان دەگەیەنیت , گۆرنگ کە ئەم هەوالەی بیست زۆر نیگەران دەبیت و هەموو بەرپرس و کاربەدەستان بانگهیشت دەکات لە سەرو هەمویانەوە ( گۆبلز و رینهارد هیدریش ) جیگری ( هملر ) و ( والتر فنك ) وەزیری ئابوری و نارەزایی خۆی پیشاندا و رایگەیاند زیان گەیاندن بە ئابوری وڵات هیچ کارێگەرییەکی نابیت لەسەر یەهودیەکان , بەلکو ئەلمانیا زەرەرمەند دەبیت

پیویسته یەهود لەناو ببریت نەك مال و سامانیان و داوای لیکردن کە ئەو زیانانە ببژیرن .

شایانی باسە گۆرنگ لەو ماوەیەدا زۆر دەولەمەند بوبوو و گەیشتبوە لوتکە , بەڵام لە کۆتایدا زۆر بە خیرایی رووخا . بە پێی وتەکانی (ئەلبرت شبیر ) وەزیری پڕچەك کردن و تەقەمەنی کە لە نزیکەوە گۆرنگی ناسیبوو لە کاتی لیکۆلینەوە لەگەلیدا لە دادگای ( نورمبرگ ) رایگەیاندبوو کە گۆرنگ لە ساڵی 1939 دا گەیشتبوە لوتکە , هەروەها وتی : کە زۆر ژیر و بە توانا بووە و زۆر بیری نوی بوو بەڵام هیچ کام لەو بیرەنوییانەی نەدەخستە قالبی جیبەجآ کردنەوە و هەندێک بیری زیان بەخش بون کەوای کردبوو بال بکیشیت بەسەر ژیریەکەیدا . هەروەك حەزی دەکرد بەرپرسیاریتی ئەو کارانە وەربگریت کە لە توانای خۆی گەورە ترن .

گۆرنگ تاوەکو ساڵی 1939 زۆر باش کاری دەرکرد و بەرپرس بوو لە پرۆژە چوار ساڵیەکەی لە دژی پیاوانی پیشەسازی ئەنجامی دابوو , بەڵام لە پاش ئەو ساڵە هەموو کارە باشەکانی وەل اناو تەنها خراپ و زیان بەخشەکانی مانەوە . ( شبیر ) کاتیك گۆرنگی ناسیبوو وەك دیکۆرسازیکی هتلر کاری کردبوو لە بڵاوکراوە تایبەتیەکەیدا باسی کردبوو کە چۆن پارە و پول و خەرجی بەلای گۆرنگەوە کاریکی ئاسان و ئاسایی بووە . گۆرنگ وەزارەتی ( بلاروسیا ) کە کەوتبووە مەیدانی (لیزغ) ەوە لە یەکیك لە باخچەکاندا کردبویە کۆشیکی گەورە و یەکیك لە نوسینگەکانی لەو وەزارەتەدا فراوانی ئەو ژورەی بریتی بوو لە ( 1500 ) پآ چوار گۆشە , بەڵام نوسینگە هەرە گەورەکەی بە کورسیەکی شاهانە رازاندبوەوە کە هیچ گوێی بەو پارە و پولە نەدەدا کە دەچووە ئەم جۆرە کارانە .

لە سەرەتای ساڵی 1939 دا باوەژنیکی دەمریت و هەموو کۆشك و سامانەکەی بۆ گۆرنگ جآ دەهیلیت و بەم شیوەیە گۆرنگ دەیویست ببیتە دەولەمەندترین کەس لە ئەلمانیادا و سامانیکی یەکجار زۆری هەبوو لە تابلۆی هونەری و خشل دا .

# ئەو هەوڵانەی دەدران بۆ دەستگیرکردنی هتلر

لەم کاتانەدا کێشەی ( چیك ) گەیشتبووە ئاستەنگ بەهۆی هەلویستەکانی هەردوو دەولەتی بەریتانیا و فەڕەنسا نەك هەر تەنها بەرامبەر حکومەتی وڵاتانی دراوسآ و هاوپەیمان بەلکو بەرامبەر گەلەکانیشیان چونکە ئەو سەردەمە سستی بەڕیوەچوونی ئابووری و بڵاو بونەوەی ڕیژەیەکی زۆری بێکاری لە ئارادا بوو هەر لەبەر ئەم هۆیەش زۆربەی ئەو گەڵانە حەزیان نەدەکردو و نەیان دەویست دووچاری جەنگ و ئاکامەکانی ببنەوە بەڵام هتلر ئەم هەڵانەی قۆستبووەوە و بە ڕوالەت بانگهیشتی ئاشتی دەکرد و ئەوەشی دوپات دەکردوە کە بوونی دەولتیکی گەورە و بە توانا لە ئەلمانیادا ڕێدەگریت لە بڵاوبونەوە و تەشەنەکردنی شیوعیەت بەرە و ڕۆژئاوای ئەوروپا .

گۆرنگیش لە هەموو ئاهەنگی ڕاو و ئەو ئاهەنگە گەورانەی کە پیاوانی کاربەدەست و سیاسەتمەداری وڵاتان تیایدا ئامادە دەبوون وتەکانی سەرکردەکەی دەدا بە گوێی ئامادەبووانـدا کە گوێیا هتلر داوای ئاشتیەکی سەرتاسەری و هەمیشەیی دەکات لە جیهانـدا و لە هەمانکاتیشدا ئاستی توانا و هیزی ئەو وڵاتانەی پیوانە دەکرد گەر بیت و لییان بدریت . لە پاشان بە ئامادەبووان دەلیت لە دبلۆماسی و سیاسەتمەدارانی ( فەرەنسا و ئەنگلتەرا ) کە ( چیك و سلۆڤاکیا ) دەولەتیکی ئاسایی نییە و پیشکەوتووە و هیچ پیویست نییە لەبەرهاژە و هوژەی

هتلر به مه‌به‌ستی گه‌ڕاندنه‌وه‌ی زه‌ویه‌کانی ( سویدت ) بۆ ئه‌لمانیا جه‌نگ به‌رپا ببیت .

له مانگی مایۆی 1938 دا بالیۆزی به‌ریتانیا له براگ له نوسراویکیدا حکومه‌ته‌که‌ی ئاگادارکرده‌وه که گۆرنگ چیتر ناتوانیت نیه‌تی هتلر له داگیرکردنی ( چیك و سلۆڤاکیا ) بشاریته‌وه که به نیازه له هاوینی داهاتوودا ئه‌نجامی بدات .

له 28 ی مایوی 1938 دا هتلر به هه‌ریه‌ك له گۆرنگ و ( بروشتش و فون رینترۆب) ی ڕاگه‌یاندا که سوره له‌سه‌ر ونکردن و خاپورکردنی ( چیك و سلۆڤاکیا ) له‌سه‌ر نه‌حخشه‌ی ئه‌وروپا .

ئه‌نجا گۆرنگ هه‌ستا به وتویژکردن له‌گه‌ڵ ئه‌و ده‌وله‌تانه‌ی سنوریان له‌گه‌ڵ چیك و سلۆڤاکیادا هه‌یه که هه‌ردوو ده‌وله‌تی ( پۆله‌ندا و مه‌جه‌ر ) بوون سه‌باره‌ت به دابه‌شکردنی چیك و سلۆڤاکیا له‌گه‌ل ئه‌لمانیادا . له‌لایه‌کی تره‌وه سه‌رکرده‌کانی جه‌نگ و له‌سه‌ر و هه‌موویانه‌وه جه‌نه‌ڕال (لویدج بك ) سه‌رۆکی هه‌یئه‌تی ئه‌رکانی گشتی جه‌نگ له‌وه ده‌ترسا که سیاسه‌ته‌کانی هتلر دووچاری جه‌نگیکیان بکات که پیشتر خۆیان بۆ ئاماده نه‌کردبیت له‌گه‌ڵ ده‌وله‌تانی فه‌ره‌نسا و ئه‌نگه‌لته‌را , بۆ ئه‌وه‌ی له‌م جۆره مه‌ترسیه رزگاریان بیت بڕیاریاندا هه‌ستن به ئه‌نجامدانی کوده‌تایه‌ك و تیایدا هتلر ده‌ستگیر بکریت .

فه‌ره‌نسا لای خۆیه‌وه رایگه‌یاند که به‌پآی ئه‌و په‌یماننامه‌یه‌ی له نیوان ئه‌وان و چیك و سلۆڤاکیادا به‌ستراوه ,فه‌ره‌نسا مافی به‌رگری کردنی هه‌یه له هه‌ر ده‌ستدریژیه‌ك که بکریته سه‌ر سنوری چیك و سلۆڤاکیا , به‌ڵام به‌و پآیه‌ی که گۆرنگ شاره‌زاییه‌کی زۆری هه‌بوو له‌گه‌ڵ ئه‌م ده‌وله‌ته‌دا , ئه‌نجامدانی ئه‌و کاره‌ی له‌لایه‌ن فه‌ره‌نساوه به دورزانی .

( چمبرلن ) سه‌ره‌ك وه‌زیرانی به‌ریتانیا هیچ گرنگی نه‌ده‌دا به چاره‌نوسی چیك و په‌نای برده به‌ر زمانی دبلۆماسی بۆ چاره‌سه‌ری کێشه‌که له‌گه‌ڵ ئه‌لمانیا .

( هندرسن ) ی سیری به‌ریتانیاش به هتلری ڕاگه‌یاند که سه‌ره‌ك وه‌زیرانی به‌ریتانیا ئاماده‌یه کاری ناوبژیوان ببینیت له نیوان ئه‌و و (ئه‌دوارد نه‌به‌ش ) سه‌ره‌ك وه‌زیرانی چیك و سلۆڤاکیا . له‌و ئاهه‌نگه ساڵانه‌یه‌ی که نازییه‌کان له

نۆرمبرگ سازیان دەکرد گۆرنـگ لە وتاریکیدا دەربـارەی چیك وتبوی ؛ ( ئەو میللەتە بێ کەلکە کورتە  باڵا بەرهەلستکارە دژ بە ئەلمانیا ) .

لەو کاتەی کە خەریك بوو جەنـگ هەلدەگیرسا رایگەیاند کە ئامادەیە بچیتە ئەلمانیـا بـۆ گـۆڕینەوەی بیـر و ڕا و گەر پیویسـت بـوو داواکارییەکـانی ئەلمانیـا جێبەجێ دەکات .

کۆبوونەوەیەك لە نیوان ( چمبرلن ) و هتلر لە 15 ی سیبتەمبەر ئەنجامدرا بە ئامادەبوونی گۆرنـگ و رینترۆب وەزیری دەرەوەی ئەلمانیا . پیش ئەوەی کە چمبـرلن بگەڕیـتەوە هندرسـن چـاوپیکەوتنیکی لەگەڵ گۆرنـگ لە کـارین هـۆل ئەنجامـدا , بەڵام دەمـودوی گۆرنــگ گۆرانکـاری تیـادا بـوو , بـۆ رۆژی دواتـر گۆرنگ داوای لە کەمایەتیەکانی ناو حکومەتیچیك و سلۆڤاکیا کرد خۆپیشـاندان و گیر و گرفت بۆ حکومەتی چیك ئەنجامبدەن بۆ زیاتر گۆشە گیرکردنی .

لە پاشان بە یارمەتی و هاوکاری فەرەنسا چمبرلن توانی پەستان بخـاتە سـەر چیـك بـۆئەوەی زەویەکـانی سـویدت بـدەن بە ئەلمانیـا و هەڕەشـەی لە سـەرۆك وەزیـران ( نەبەش ) کـرد گەربیـت و ئەو زەویـانە نەدریتە ئەلمانیـا ئەوا هەردوو دەولەتـی   فەرەنسـا و ئەنگەلـتەرا پاشـگەز دەبـنەوە لە پاراسـتنی سنوری چیـك . نەبەش لە سـەرەتادا قایـل نەبـوو بەڵام لە پاشـان ڕەزامەنـدی پیشـاندا . کاتیـك کە چمبـرلن گەڕایەوە بـۆ  بینینـی هتلـر بینـی کە هتلرسـورە لەسـەر داگیـر کردنـی سەربازی زەوییەکانی ( سویدت ) لە جیاتی وەرگرتنی ئەو زەویـانە بە ڕێگەیەکـی ئاشتی .

لیــرەدا چمبــرلن زۆر هەســتی بە شــکان و نیگەرانــی کــردوو گەرایەوە (ئەنگلـتەرە) . لەو کـاتەدا چیـك خـاوەنی یەك ملیـون سـەرباز بـوو و فەڕەنسـاش کەوتە خـۆ ئامــادەکردن لە ڕووی ســەربازییەوە و بەریتانیــاش دەســتی کــرد بە پـڕچەك کردنـی ( ئوسـتوڵا )ە کـانی و ئەمریکـاش نـاڕەزایی خـۆی پیشـاندا بەڵام هتلـر  هیچ گـویی بەم کـارانە نەداو لە  وتاریکدا لە ڕۆژی ( 26 ) ی سبتەمبەردا سوربوونی خۆی لەسـەر داگیرکردنـی  زەوییەکـانی ناسراوە بە ( سویدت ) ی بە زەبــری هیــز لە ( 1 ) ی ئەکتــۆبەردا              ڕاگەیانــد . بەلای فەڕەنســی و بەریتانیەکانەوە تەنها گۆرنـگ دادەنرا بە هۆیەك بۆ فریاکەوتنی ئاشتی .

گۆرنـگ قایل بوو بە کاری ناوبژیوانی , بەڵام سوربوونی هتلر گـۆرنگی بـی متمانە کرد لەبەردەم ئەو دەولەتانە . هتلر کەوتبووە ژیر فشـاری (رینتروب) ەوە

که هانی هتلری دەدا به بەکارهینانی هیز هەرچەندە گۆرنگ بەردەوام لەژیر فشاری ( فرانسوا بونسیه و هندرسن ) بالیۆزانی فەرەنسا و بەریتانیادا بوو ، داوای له هتلر دەکرد که ڕێگەی وتویژ و لەسەر میز کێشەکە چارەسەر بکریت چونکه گۆرنگ پێی وابوو هیشتا ئەلمانیا لەو توانایەدا نییه دووچاری جەنگ بیتەوه و ئەو له پلەیەکی وادایه که له فۆن رینترۆب باشتر دەتوانیت بڕیار بدات .

( هندرسون ) وتبووی لەبەردەم هتلردا گۆرنگ ( رینتروب ) ی به نەزانیکی تاوانبار ناوبرد و هەریەك له گۆرنگ و رینتروب ویستویانه سەرنجی هتلر بەلای خۆیاندا رابکیشن تاوەکو ئەو کاتەی که (مۆسولینی) دەخالەت دەکات و بڕیار دەدات که له هەوڵیکدا خۆی و هتلر و چمبرلن و ودیلادیەی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا له میونخ کۆ بکاتەوه و هیچ بانگهیشتیك نەکرا بۆ نوینەرایەتی چیك و سلۆڤاکیا و لەو کۆبوونەوەیەدا پیکهاتنی میونخ مۆرکرا بەبآ ئامادەبوونی گۆرنگ و زۆر له سەرکردەکانی ئەلمانیا که بڕیاریاندا به کودەتایەك هتلر لەسەر حوکم لابچیت چونکه داواکاریەکانی خۆی بەبآ جەنگ هینایه دی . هتلر له وەرگرتنی زەویەکانی ( سویدت) دا کارگەکانی ( سکودای ) جەنگی چیکی قازانج کردبوو , له پاشان خستیه سەر ئابوری ئەلمانیا و له 5 ی ئۆکتۆبەردا چمبرلن دەستی له کار کیشایەوه و دورکەوتەوه و هتلر بآ ئەوەی بوار بدات به تیپەڕبوونی ئەو کێشەیه لەگەڵ گۆرنگدا خەریکی پیلان دانان بوون بۆ دەست بەسەرا گرتنی تەواوی چیك و سلۆڤاکیا و بۆ ئەم مەبەستە هەستان به هاندانی ( سلوك ) که به شیکه لەو ولاته ، لەرووی ئابوریەوه سەربەخۆ بیت و لەگەڵ ئەلمانیادا یەك بگریت هەروەك ( پۆلەنده و مەجەر) یان هاندا بۆ سەندنەوەی زەویەکانی تایبەت به دەولەتەکانیان که دەکەویته لای چیك و سۆڤاکیا .

*   *   *

# داگیرکردنی پڕاگ و پیشڕەوی بەرەو پۆڵەندە

گۆرنــگ بەردەوام پەیوەنــدی هەبــوو لەگەڵ ( جــۆزف لیبســکی ) بــالیۆزی پۆلەندە لە ئەلمانیا بۆئەوەی هەوڵ بدات نیەتــی هتلر لە داگیرکردنــی ئەو دەولەتە بڕەوینیتەوە .

شــایانی باســە کە هتلــر پۆلەنــدەی لە ســەرەتای لیســتی خــۆی دیــاری کردبــوو دوای کۆتایی هاتنی کێشەی چیك و سلۆڤاکیا لە هەمانکاتدا گۆرنــگ پەیوەندیەکانی گەرم دەکرد لەگەڵ رۆبەرت کولاندەر بالیۆزی نویی فەرەنسا و پێــی ڕاگەیاندبوو گەرهــاتوو لەگەڵ رینتــروب پیکنەهــاتن ئەوا لەگەڵ ئەو وتــویژ بکــات ئەمە لەو ساڵەدا بوو کە گۆرنــگ ســەردانی ئیتالیای کرد ساڵی 1939 بوو لەگەڵ کۆنت شــیانو وەزیــری دەرەوەی ئیتالیــا و لە هەمانکاتیشــدا زاوای مۆســۆلینی بــوو وە میردی دوتش ئارا بوو .

( شیانو ) زۆر ســەرنجی گۆرنگی داو بە ( کــاوبۆی ) لە قەڵەمیدا , چــونکە گۆرنــگ جــل و بەرگیکــی خــاکی تــاریکی لەبەردا بــوو و بۆینبــاغەکەی ملــی بە چنراویکــی زیــڕین رازانــدبۆوە کە چەنــد یــاقوتیکی لەســەربوو ، لە دەســتیدا چەنــد مستیلەیەکی پلاتینی تیرکراوی بە یاقوت لە پەنجەکانیدا هەبووە و نینۆکەکــانی بە ( مــانکیر ) پۆلیش کردبــوو وە لەلای راســتی جــل و بەرگەکەی ئــارمی نــازی لە ئەلماس دروستکراوی بە خۆدا هەلواسیبوو .

لە سەرەتای ساڵی 1939 دا تەندروستی گۆرنگ ئالۆز دەبیت و دەستدەکات بە کەمکــردنەوەی کیشــی لەشــی . کاتیــك ئــالۆزی دەکەویــتە نیــوان ( چیــك ) و ( سلۆڤاك ) وە بەهۆی نەخشــە و پیلانەکــانی هتلــرەوە ، هتلــر گۆرنــگ لە ( ســانڕیمۆ ) دەگیــریتەوە لەو کــاتەی ســەرگەرمی ســازکردنی کۆبــوونەوەیەك بــوو لە نیــوان ( رامیــل هاشــا ) ســــەرۆکی دەولەتــــی چیــك کە هــاتبووە بەرلــین ، لە بارەگــای راویژکــاران پــاش ئەوەی کە هاشــا بڕیــاری بەڕێــوەبردنی دەســەڵاتی عــورفی لە وڵاتدا دەرکرد بە هۆی ئالۆزی نیوان وڵاتەکەی و سلۆڤاك . هتلــر ســەرکردەکانی ســلۆڤاکی قــایلکرد کە بڕیــاری جیــابوونەوە لە چیــك بــدەن و ســـەربەخۆیی رابگەیەنــن , لە پاشــان هتلــر بە هاشــا رادەگەیەنیــت کە وڵاتەکەی داگیــر دەکریــت

لەلایەن هیزەکـانی ئەلمانیـاوە و وتبـوی کە پیویسـتە بە تەلەفـۆن بە وڵاتەکەی رابگەیەنیت بەرهەلستی لە دژی هیزی داگیرکەری ئەلمانی نەکەن . گۆرنگیش لای خـۆیەوە بە سـەرۆکی دەولەتـی چیکـی ڕاگەیانـد گەر بیـت و ئەم داواکـارییە جیبەجێ نەکـات ئەوا ( بـراگ ) بۆمبـا بـاران دەکریـت لەلایەن هیـزی ئاسـمانی ئەلمانیاوە .

سەرۆك هاشا بەهۆی ئەم وتە رەقانەوە هەر لەویدا توشـی ( تەوژم / جەلتە ) دەبیـت و بە هاوکـاری پزیشـکی تـایبەتی هتلـر کە ( مـۆلەر ) ناویـك دەبیـت سـەرۆك لە مـردن رزگـار دەکەن . لە پاشـان هاشـا بە تەلەفـۆن بە بـراگ رادەگەیەنیت بەرگری نەکەن و هەموو چەك بن و بەم شیوەیە چیك و سلۆڤاکیا لە شـەوی 15 ی مارسـی 1938 دا سـەربەخۆیی خـۆی لەدەسـت دەدات و بـۆ رۆژی دواتـر کە رۆژی 15 ی مـارس دەبیـت هتلـر بەرەو بـراگ بەرآ دەکەویـت بۆ ئامادەبوون لە نمایشیکی سەربازی سوپا داگیرکەرەکەی لە کاتیچوونە نـاو ئەو شارەوە . جیهان لە ئاست ئەو روداوەدا چاوی لیك ناو رووی بەوڵادا کرد .

بەڵام پۆلەنـدە هەسـتی بەو مەترسـییە کـردوو زانـی کە دواتـر هتلـر داوای ( دانـزغ ومەجەر ) ی پۆلەنـدی دەکـات . بـارودۆخەکە خراپتـر بـوو کاتیـك کە ( لیتوانیا ) شاری ( ممل ) ی دابوو بە ئەلمانیا لە 22 ی مارسدا .

وڵاتـانی رۆژئـاوا زۆر نـیگەران بـوون بەرامـبەر بەو کـارانەی هتلـر , هەربـۆیە ( چرچل ) لە وتـەیەکیـدا لەبەردەم ئەنجـومەنی ( عمـوم ) ی بەریتانیـادا رایگەیانـدبوو کە بەریتانیـا بەرگـری لە پۆلەنـدە دەکـات گەر دەسـتدریژی بکـریتە سەر , بەڵام هتلر ئەنجامدانی ئەم کارەی بە دوور زانی چونکە کاتیك کە زەوی ( رین ) و لە پاشـان ( سـار ) و ئەنجـا (نەمسـا) و زەوییەکـانی ( چیك و سلۆفاکیا ) داگیرکران لەلایەن ئەلمانیاوە زۆریك لەم جۆرە وتە و بەلینـانەی دەبیست لەلایەن ئەنگلتەرە و فەرەنساوە بیئەوەی هیچیـان جیبەجی بکرین هەر لەبەر ئەم هۆیەش بـوو هـیچ گرنگـی نەدا بەو پەیماننـامەیەی لە ( 16 ) ی ئەپریلـی 1939 دا لە نیوان پۆلەندە و بەریتانیادا بەستراوە و بڕیاری داگیرکردنـی پۆلەنـدە دەدات لە ( 1 ) ی سیبتەمبەری 1939 دا و فرمان دەدات بە هیزەکانی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی کە ئامادە بن .

له ( براگ ) رینتروب هاوڕییەتی هتلری دەكرد له جیاتی گۆرنگ كه پیشەی بووبوه هیورکردنەوەی ئەوانەی كه له نەخشه و پیلانەكانی هتلر دەترسان .

لەپاش مۆرکردنی ( بەڵگەنامەی ئاسنین / المیثاق الحدیدی ) له نیوان ( ئیتالیا و ئەلمانیا ) دا پادشای ئیتالیا ( ڤیكتور عمانوئیل ) مەدالیایەك كه بریتی بوو له( ملوانكەی ئەنوتزیاتا ) بەخشی به ( رینتروب ) كه نیشانیكی بەرز بوو له ئیتالیادا .

گۆرنگ له كاتی ئامادەبونی مەراسیمی ئەم نیشانه و بەخشینی به رینتروب خەریك بوو دەگریا و له پاشان پیویست بوو لەسەر مۆسۆلینی و شیانو و بالیۆزی ئەلمانیا له ئیتالیا كه كۆشش بكەن بۆ ئەوەی پادشا هەمان نیشان بداته گۆرنگ گەر نا ئەوا پەیوەندی نیوان هەردوو وڵات ئالۆز دەبیت .

بەڵام پادشا قایل نەدەبوو به بەخشینی ئەونیشانه به گۆرنگ تا ئەو كاتەی مۆسۆلینی دەخالەت دەكات له پاشان له مایۆی 1940 دا هەمان نیشان دەدات به گۆرنگ .

هەرچەنده گرنگی گۆرنگ لای هتلر رووی له كزی دەبوو , چونكه گۆرنگ زیاتر بەهۆی دەولەمەندیەوه تیكەڵا به خۆشیەكانی ژیان بوبوو ئەو گرنگیەی به حكومەت و ئیشوكارەكانی نەدەدا .

له ( 23 ) ی مایوی 1939 دا هتلر له كۆنگرەیەكدا بەسەرجەم سەركردەكانی ئەلمان دەلیت كه رەگی ژیانی ئەلمان له رۆژهەڵاته و پیویسته پۆلەنده داگیربكەین و ئەگەر هاتوو فەرەنسا و بەریتانیا دەخالەتیان كرد ئەوا دەبیت به هیز قایل بكرین و دان بەم كارەدا بنیین .

له پاشان بەلینیدا به گۆرنگ كه له سەروو ئەوەی كه سەركردەی گشتی هیزی ئاسمانی و وەزیری فرۆكەوانیه و له هەمانكاتدا سەرپەرشتیاری پرۆگرامی پڕچەك كردنی ئەلمانیایه , هەستیت به كەمكردنەوەی گرنگی بەریتانیا به پۆلەنده و وەك پارویەك ئەلمانیا قوتی بدات ئەوەش له ڕێگەی بانگهیشت كردنی ئاشتی له كاتیكدا كه هتلر خۆی ئاماده دەكات بۆ جەنگ .

له مایۆی 1939 دا گۆرنگ به ( هنریش ) رادەگەیەنیت كه پیویسته پەیوەندیەكانی نیوان ئەلمانیا و بەریتانیا زیاتر پتەوتر بیت و گرنگ نییه كه

بەریتانیا خۆی ببەستیتەوە بە پۆلەندەوە . هنریش گۆرنگی خۆش دەویست و زۆر لە سەردانەکانیدا بۆ ئەلمانیا سەردانی گۆرنگی کردووە لە کارین هۆل .

هندرسن دەربارەی گۆرنگ نوسیبوی کە گۆرنگ لە سەرکردەکانی دیکەی ئەلمانی جیاوازتر نییە و باشتریش نییە بەڵام ئەوەی من لیی دلنیام ئەوەیە کە گۆرنگ نایەویت جەنگ بەرپا بیت و لەلایەکی ترەوە زۆر رق ئەستورە بەرامبەر رینتروب , بەڵام بەو پێیەی کە گۆرنگ بەرپرسە لە کۆشش کردنی خۆ سازدان بۆ جەنگ لە ئەلمانیادا پیویست بوو لەسەری هەستیت بە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو لە 23 ی یۆنیۆی 1939 دا سەرۆکایەتی کۆبونەوەیەکی کرد کە بە ( لیژنەی بەرگری لە رایخ ) ناسرابوو , لەو کۆبونەوەیەدا لیکۆلینەوە لەسەر ئەرك و هاندانی کریکاران کراو بریار درا کریکاران پەیوەندی بکەن بە کارگە و پیشەسازییە جەنگیەکانەوە بە تایبەت چیکیەکان و دیلە سیاسیەکان لەگەڵ بەکارهینانی( بە زۆر کارپێکردنیان / العمل ألآجباري ).

لە هەمانکاتدا بەردەوام بوو لە سیاسەتی فیلکردن و دەست برینی بەریتانی و پۆلەندیەکان و پآی دەوتن کە تاکە ریگر لەبەردەم پتەوکردن و قوڵا کردنەوەی برایەتی و تیگەیشتن لە نیوان ئەلمانیا و پۆلەندە و ئینگلتەرەدا بوونی ئەو پەیماننامەیە یە کە لە نیوان هەردوو دەولەتی بەریتانیا و پۆلەندەدایە و بە هەرەشەیەکی بآ پیویست دەزانریت لەلایەن ئەلمانیاوە .

* * *

# هتلر و بەریتانیا

شایانی باسە ئەم جۆرە کارە دبلۆماسیەی گۆرنگ بووە هۆی پەیدابوونی چەند روداویك لە نیوان مانگی یۆلیۆ و ئۆگەستدا , لەو روداوانە یەکیك لە هاوڵاتیانی سوید کە ناوی ( بیرجروا ملریس ) بوو پەیوەندی توندوتۆلی هەبوو لەگەڵ گۆرنگدا هەوڵیدا هاوکاری گۆرنگ بکات بۆ ئەوەی ئاشتی لە ئەوروپادا بەرقەرار بیت پاش ئەوەی هەموو کاریکی دبلۆماسی لەو روەوە شکستی هینابوو ,ئەم هاوڵاتییە سویدیە ماوەیەکی زۆر لە بەریتانیا ژیابوو , دلنیا بوو کە نازیەکان لە زۆر مەبەست و هیوای بەریتانیا بێ ئاگان و ناتوانن لەو مەبەستانە

بگەن لە ئەوروپادا لە پشت بەستنی پەیماننامەی هاوبەشی تایبەت بە بەرگری لە پۆلەندە و ئەو وای بۆ دەچیت کە هتلر بە هەڵەدا چووە لەمەڕ بەریتانیەکانەوە و نەیدەزانی کە بەریتانیا چەند سورە لەسەر متمانەو پەیوەست بوون بەو پەیماننامەیەوە لەگەڵ پۆلەندە .

بۆیە هەوڵی دا پەیوەندی بکات بە هاوریکەیەوە کە گۆرنگ بوو بۆ ئەوەی ببیتە گەیەنەریك لەگەڵ حکومەتی ئەلمانیادا و بڕیاریدا کە گۆرنگ چاوی بکەویت بە کۆمەلیك لە کەسایەتی و پیاوانی پیشەسازی بەریتانی بە شیوەیەکی نهینی بۆ ئەوەی لە راستی باردۆخەکە بگات دوور لە بەریوەبەریتییە دبلۆماسیە تەسکەکان .

لە( 5 ) ی یۆلیۆ ( واهلریش ) چاوی کەوت بە گۆرنگ لە کۆشکی کارین هول و گۆرنگ زۆر بە گەرمی پیشوازی لیکرد و پاش ئەوەی رەزامەندی هتلری وەرگرتبوو لە هەموو راو بۆچوونەکاندا رەزامەندی خۆی پیشاندا لە پاشان گۆرنگ وتی کە زەحمەتە بەریتانیەکان پابەند بن بەو پەیماننامەیەوە لەگەڵ پۆلەندەدا .

جگە لەوە نەبیت کە بەریتانیەکانرەش بینن بەرامبەر بە فراوان بوونی خیرای ئەلمانیا و پیچشکەوتنی وە دەیانەویت کە پۆلەندە بەکاربهینن بۆ ئەوەی ڵالە دژی بوەستن لەگەڵ ئەوەشدا گۆرنگ چاوی دەکەویت بە کۆمەلیك لە پیاوانی پیشەسازی بەریتانی .

لۆرد ( هالیفاکس ) یش کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو قایل بوو بە ئەنجامدانی ئەو کارە بەڵام نکولی لە پابەندبوون بەو بڕیارانەوە کرد کە لەو کۆبوونەوەیەدا دەدریت .

هتلریش بەو هیوایە دەیڕوانیە ئەو کۆبوونەوەیە کە ئەنجامەکانی ببیتە لە رزۆك کردنی پابەندی بەریتانیەکان لە مەڕ پۆلەندە .

لە ( 7 ) ی ئاگۆستدا حەوت لە پیاوانی خاوەن کەسایەتی بەریتانی لەگەڵ گۆرنگ کۆبوونەوە لە خانوی خیزانەکەی ( واهلریش ) لە باشووری دانیمارك .

پاش ئەوەی گۆرنگ خۆی دەناسینیت ، وەك ئەرکیکی دبلوماسی بڕیار دەدریت لەو کۆبونەوەی خوانەدا ( پیکی ئاشتی ) بخوریتەوە لە پاشان گۆرنگ باس لە نیەت پاکی ئەلمانیا دەکات و ڕایدەگەیەنیت کە ئەلمانیا هیچ مەبەست و نیەتیکی نییە لە ئابلوقەدان یاخود لەناوبردنی پۆلەندە هەروەها وتبووی

چارەسەرکردنی کێشەی ( دانزج ) و ڕیرەوی پۆلۆنی دوا دواکاری هتلرە لە ئەوروپادا .

بەریتانیەکان لای خۆیانەوە سەرزەنشتی هەلسوکەوتی هتلریان کرد لە مەڕ چارەسەرکردنی کێشەکانی کەمایەتییە ئەلمانیەکان کە نەك هەر مانای دەستدریژی دەگەیەنیت بەلکو سروشتیش نییە .

ئەو کۆبونەوەیە تەواوی ئەو ڕۆژەی خایاند و هەمووان دلخۆش بوون و کۆبوونەوەکە کۆتایی پیهات بە هیوای ئەوەی کە کۆنگرەیەك بە ئاگاداری حکومەتی بەریتانی و ئەلمانی ببەستریت لە وڵاتی ( سوید ) کە بێ لایەن بوو بۆ لیکۆلینەوە لە کێشەی ئەلمانیا و پۆلەندە .

شایانی باسە ( واهلریش ) زۆر دلخۆش بوبوو بە سەرکەوتنی هەوڵکەی .

بەڵام ئەو کۆنگرەیە نەبەسترا چونکە تەنها سێ هەفتە مابوو بۆ ئاشتی هەرچەندە واهلریش تەواوی تواناى خۆی خستە کار و بەردەوام لە پەیوەندی کردندا بوو لەگەڵ گۆرنگ و بەریتانیەکان ، بەڵام هیچ ئەنجامی نەبوو .

چونکە ڕینتروب پەیدابوو و پەیمانی نامەیەکی لەگەڵ ڕووسدا مۆر کردبوو بە مەبەستی دابەشکردنی پۆلەندە هەروەها پەیماننامەی پاراستنی خاکی ڕوس .

گۆرنگ ئاگاداری ئەم کارەی رینتروب بوو بەڵام گویی نەدایە و لەسەر سیاسەتی خۆی بەردەوام بوو تا کۆتایی .

لە ( 14 ) ی ئاگۆستدا گۆرنگ و سەرجەم سەرکردە ئەلمانیەکان لەلایەن هتلرەوە بانگهیشت کران بۆ ( بریخستگادن ) کە بارەگای هتلر بوو لە چیاکانی ( ئەلب ) لەویوە هتلر ڕایگەیاند .

بەریتانیا ناتوانیت سەرکردایەتی بکات لە جەنگدا هەروەك داگیرکردنی پۆلەندە تەنها یەك هەفتەی دەویت و هیچ شتیکی لە پەیماننامەی نیوان ئەلمانیاو ڕووسیا باسی نەکرد تاوەکو دوای کۆتایی هاتنی ئەو کۆبونەوەیە بەیەك هەفتە .

کە تەواوی جیهانی سڕکرد بە ڕاگەیاندنی ئەو پەیماننامەیە .

گۆرنگ هەوڵیدا لەو چەند ڕۆژە کەمەدا بەر لە دەست پیکردنی جەنگ دژ بە پۆلەندە سەردانی بەریتانیا بکات بە نیازی هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی ئەگەری یارمەتی بەریتانیەکان بۆ پۆلەندە لە ڕۆژی 23 ی ئاگۆستدا لە کۆشکە هاوینەکەی لە ( چیکرز ) بە هیوای کۆبونەوە بوو لەگەڵ سەرۆك وەزیران بەڵام

سەرۆکی ئەو دەولەتە ئامادەبوو بۆ چاو پیکەوتنی گۆرنگ دواجار لەلایەن هتلرەوە ئەو کۆبونەوەیە هەلوەشینرایەوە .

ڕۆژی 24 ی ئاگۆست واهلریش سەردانی گۆرنگی کرد لە بەرلین و گۆرنگ داوای لیکرد کە بەرەو بەریتانیا بکەویتە ڕێ و بە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ڕابگەیەنیت کە چەند ڕوداویکی گرنگ لە ئارادایە و بەندە بەو هەلسوکەوتانەی بەریتانیا دەیکات لە کاتی جەنگدا و ئەو پەیماننامەیەی لەگەڵ روسیادا مۆرکراوە هتلری زیاتر سورکردوە لەسەر داگیرکردنی پۆلەندە . لەسەر داوای گۆرنگ واهلریش گەیشتە لەندەن و داوای لە لۆرد هالیفاکس کرد نوسراویك لەسەر داوای گۆرنگ بۆ گۆرنگ خۆی بنوسیت و تیایدا خواستی ( ئەنگلتەرە ) بۆ ئاشتی روون بکاتەوە , ئەمەش لە کاتیکدا بوو کە گۆرنگ زانیبووی لەو رۆژەدا لە لەندەن هەردوو حکومەتی بەریتانی و پۆلەندی پەیماننامەیەکیان مۆرکردوە بە مەبەستی هاریکاری یەکتری و نوێ کردنەوەی بەلینی ( چمبرلن ) لەبەردەم ئەنجومەنی عمومدا .

کاتیك کە واهلریش گەڕایەوە بۆ بەرلین , بینی گۆرنگ زۆر بە نیگەرانی و خەمباریەوە لەناو شەمەندەفەرە تایبەتەکەی خۆی لە نزیك کارین هول دانیشتوە , پاش ئەوەی کە نوسراوەکەی لۆرد هالیفاکسی دەداتێ بەیەکەوە بە وردی گوێ لە دەقەکەی بە وەرگیردراوی بۆ سەر زمانی ئەلمانی دەگرن , لەپاشان گۆرنگ بڕیار دەدات ئەو نوسراوە بگات بە هتلر بە زوترین کات .

* * *

# تەوژمی هستریای هتلری

لەپاشان واهلریش لەلایەن هتلەرەوە بانگهیشت کرا بۆ بارەگای راویژکاران و لەگەڵ گۆرنگ لە چاوەڕاونی هتلردا بوون کاتیك کە هتلر دیتە لایان دەست دەکات بە باسکردنی میژووی ئەلمانیا و ئەو سیاسەتەی کەوا پیویست دەکات ئەلمانیا فراوان بیت بۆ واهلریش , هەروەها باسی هیزی سوپاکەی و هیزی چەکی ئاسمانی پتەوی کرد , گۆرنگیش ناوبەناو تیشکی دەخستە سەر چەند باسیك و دلنیایی دەخستە سەر باسەکانی هتلر .

لە ناکاو هتلر دەنگی بەرز دەبیتەوە و هاوار دەکات و دەلیت : گەر بیت و جەنگ هەلبگیرسیت ئەوا زیاتر و زیاتر کەشتی ژیر دەریایی دروست دەکەم . لەپاشان زیاتر دەماری گرژ دەبیت و دەلیت زیاتر پەرەش دەدەم بە دروستکردنی فرۆکەی جەنگی و دوژمنانمی پێ لەناو دەبەم . لەم کاتەدا گۆرنگ هیچ گوێ بەو تەوژمە هستریەی هتلر ناجات و بێ دەنگ بوو , ئەو هەموو هاوار و پەشۆکانەی هتلر هیچ کارێگەری نەبوو لەسەری , واهلریش ئەم دیمەنەی گۆرنگی بەڵاوە سەیر بوو بەڵام گۆرنگ بەم دیمەنە شانۆییانەی هتلر ڕاهاتبوو دەشیزانی کە هۆکەی چییەو ئەنجامەکەشی چی دەبیت . پاش کەمیك هتلر هیواش دەبیتەوە و بە واهلریش رادەگەیەنیت بگەریتەوە بۆ لەندەن و ئەم باسە بۆ بەریتانیەکان رونبکاتەوە , ئەنجا واهلریش لە هتلر دەپرسیت ئەو داواکاریە ئەلمانیانە چین لە پۆلەندە .

گۆرنــگ یەکیــك لە نەخشــە جوگرافیەکــان لە دیــواری نــاوەوەی ژورەکە دەکــاتەوە و بە قەڵەمیــك ئەو هەریمــانە دیــاری دەکــات کە ئەلمانیــا خواســتیتی لە پۆلەندەدا , هەروەها هتلر قایل بوو بە بەستنی پەیماننامەیەك لە نیوان ئەلمانیا و بەریتانیــادا بە گیــرانەوەی ئەو نــاوچە داگیرکــراوانەی ســەربە بەریتانیــان لە ئەفریقیــاو ڕێــگەی نەدا کە واهلــریش ئەم باســە و هــیچ شــتیك لەم روەوە لەســەر کاغەز بنوسیت .

کاتژمیر 4 ی سەر لە بەیانی واهلریش بارەگای راویژکارانی جیهیشت و بۆ پــاش نیــوەڕۆی ئەو رۆژە کە 27 ی ئۆگەســتی 1939 بــوو گەیشــتە لەنــدەن و لەگەڵ هەریەك لە چمبرلن و لۆرد هالیفاکس کۆبوەوە کە قایل بوبوون واهلریش وەك نــاوبژیوانیکی نایاســایی ئەم کــارە ئەنجــام بــدات . لە کۆتــایی گەشــتەکەیدا بە فرۆکەیەکــی تــایبەت گەڕایەوە بەرلــین لەم کــاتەدا بەریتانیــا خەریکــی خۆ ســازدان بــوو بــۆ روبەروبــونەوەی هەر روداویــك , هەرچەنــدە کە ســوپای ئەلمانیــا ســاز و ئامادە بوو زۆر لە پیشتر .

واهلریش لە کاتژمیریکی درەنگی شەودا گەیشتە بەرلــین و هــیچ نوســراویکی یاسایی پێ نییە لە بەریتانیاوە , جگە لە چەند وەڵامیکــی ســەر زاری نەبیت و دوو شــەو بــێ خــەو مــایەوە , بالیۆزخــانەی بەریتانیــا لە بەرلــین چاوەڕوانــی وەڵام بــوون جگە لەوەی کە وەڵامەکە دواکەوتبوو بەلایانەوە سەیر بوو کە واهلریش لە نیوەی شــەودا داوای چــاوپیکەوتنی بــالیۆزی بەریتــانی کــرد , لەپاشــان بەرآ کەوت بــۆ چــاوپیکەوتن لەگەڵ گۆرنــگ لە شــەمەندەفەرە تایبەتەکەیــدا و هەردووڵا ڕیکەوتــن لەســـەر چـــاوپیکەوتنی هتلـــر جـــاریکی تـــر . بـــۆ جـــاری دووەم لە رۆژی 29 ی ئۆگەستی ساڵی 1939 واهلریش چاوی کەوت بە بالیۆزی بەریتانیا هندرسن کە نیگەران بوو بە هەلسوکەوتی گۆرنــگ .

لەپاشان روون بوەوە کە هەموو هەوڵەکان شکست خواردوو بوون , چونکە رینتــروب تــیکەڵا بە کێشــەکە بــووە و هتلــر ســوربوو لەســەر هــاتنی دوو نــوینەری حکومەتی پۆلەندی بۆ بەرلین بۆ ئەوەی گوێ بیستی داواکاریەکانی ئەلمانیا بن و لەسەر بەریتانیا پیویست بوو هانی پۆلەندیەکان بدەن وتویژ بکەن لەگەڵ ئەلمانیــادا و لەم کــاتەدا ســوپای ئەلمانیــا لەســەر ســنوری پۆلەنــدە کۆکرابــوەوە , گــۆرنگیش داوای لە واهلــریش کردبــوو کە کــاتژمیر 5 ی بەیــانی بگەڕیتەوە بــۆ لەنــدەن بــۆ رزگـــاربوون لە دەســـتی . بەڵام بەریتانیەکـــان نەیاندەویســـت پۆلەنـــدیەکان بچـــنە

ئەلمانیا بۆ وتویژ , بەلكو دەبیت لەسەر خاكی وڵاتیكی بآ لایەن ئەنجام بدریت , پاش ئەوەی فۆن رینتروب داواكاریە ئەلمانیەكان دەخوینیتەوە كە بانگكرابوو بۆ وەزارەتی دەرەوە ئەوەی رەتكردەوە كە وینەیەكی ئەو داواكاریانە بداتە هندرسن بۆ ئەوەی بیداتە حكومەتەكەی , بەڵام واهلریش توانی وینەیەكی ئەو داواكاریانە لە گۆرنگ وەربگریت و بە تەلەفۆن بیدات بە بالیۆزخانەی بەریتانیا . بۆ رۆژی دواتر كە 31 ی ئەگۆست بوو كاتیك كە واهلریش سەردانی بالیۆزخانەی بەریتانیا دەكات دەبینیت كە هندرسن لەگەڵ بالیۆزی پۆلەندە لیبسكیدا كۆبۆتەوە و بالیۆزی پۆلەندە پێی وایە كە گەلی ئەلمانیا لە دژی ئەم شەڕ فرۆشتنەی هتلر رادەپەڕن و ئەوكاتە سوپای پۆلەندی لە سوپای ئەلمانیا دەدات و دەچیتە بەرلینەوە . بۆ بەرەبەیانی رۆژی دوایی , هتلر فەرمان دەدات بە سوپا بە داگیركردنی پۆلەندە بێئەوەی گرنگی بدات بە هەوڵەكانی گۆرنگ و واهلریش و هندرسن و لیبسكی .

لەپاشان واهلریش داوای لە گۆرنگ كرد مۆلەت لە هتلر بخوازیت بۆ ئەوەی لەگەڵ هندرسن راستەوخۆ گفتوگۆ بكات , هتلریش بەم داوایەی گۆرنگ قایل بوو و واهلریش خۆشی ئامادەی دانیشتنی گۆرنگ و هندرسن بوو بەڵام سەرنجیدا كە هیچ گرنگی و مەبەستیك لە وتەكانی گۆرنگدا نییە ئەوە نەبیت كە تەنها كاتی پێ دەكوژیت .

بۆ ڕۆژی دوای كاتیك كە واهلریش هەوالی پەڕینەوەی سوپاو هیزی ئاسمانی ئەلمانی لە سنوری پۆلەندە دەبیستیت چاوی دەكەویت بە گۆرنگ لە شەمەندەفەرە تایبەتەكەی خۆی دەبینیت كە گۆرنگ نیگەرانە بەرامبەر ئەم ڕوداوە ئەنجا گۆرنگ بەڕێدەكەویت بەرە و ( ڕایشتاغ ) بۆ بیستنی وتاری هتلر دەربارەی بارودۆخەكە .

هتلر لە وتارەكەیدا ئۆبالی هەلگرساندنی جەنگی خستە ئەستۆی پۆلەندە بە بیانوی ڕەتكردنەوەی وتویژ لە پاشان هتلر ڕایگەیاند كە لە پاش مردنی خۆی ئەوا گۆرنگ جێنشین دەبیت .

جاریكی تر هلریش چاوی كەوت بە هتلر بەڵام گۆرنگ كێشەكەی بەڵاوە ئاسایی بوو چونكە جەنگ هلگیرسا و گرنگ بردنەوەیەتی . بۆ ڕۆژی دواتر واهلریش لەگەڵ گۆرنگ نانی نیوەڕۆی خوارد بێئەوەی هیچ هیلاكیەك لە سیمای گۆرنگ بەدی بكات پاش هەلگیرسانی جەنگ .

ڕۆژی 3 ی سیپتەمبەر واهلریش دەقی چەند هەوالیك و ئاگاداری دەولەتی بەریتانیای لە بالیوزخانەی بەریتانیاوە گوێستەوە بۆ گۆرنگ کە تیادا بەریتانیەکان هتلر ئاگادار دەکەنەوە هیزەکانی لە پۆلەندە بکیشیتەوە لە کاتژمیر 11 ی ئەو ڕۆژە هەرچەندە دەزانن کە ئەم داواکاریە لەلایەن هتلرەوە جێبەجێ ناکریت .

هەروەك ئەم ئاگادار کردنەوەیە واتە هەلگیرساندنی جەنگ لە نیوان هەردوو دەولەتی ئەلمانیاو بەریتانیایە واهلریش داوای لە گۆرنگ کرد کە بە فرۆکەیەك سەردانی لەندەن بکات بۆ ئەوەی هیچ نەبیت بەریتانیەکان قایل بکات لە جیاتی داواکردنی کشانەوەی هیزە ئەلمانیەکان داوا بکەن کە چیتر پیشڕەوی نەکەن لە خاکی پۆلەندەدا گۆرنگ بەم داوایەی واهلریش قایل بوو بەڵام بەریتانیەکان سەردانی هەموو جۆرە کەسیکی ئەلمانیان بۆ ( لەندەن ) ڕەتکردەوە تاوەکو تەواوی داواکاری دەولەتەکەیان لەلایەن ئەلمانیاوە جێبەجێ نەکریت .

لەپاشان گۆرنگ لە بن سیبەری دار قۆخیکدا لە نزیك شەمەندەفەرەکەیدا دادەنیشیت و دەزانیت کە هیچ هیوایەك نەماوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نیوان هەردوو دەولەتی ئەلمانیا و بەریتانیا جگە لە خیرا داگیرکردنی پۆلەندە نەبیت.

بۆ ئەوەی بەریتانیا بە چەند مەرجیك قایل بیت بۆ و ویژ لەگەڵ گرنگترین بەشدا کە لیوەی نزیك بیت لە بەشەکانی ئەوروپاوە پاش داگیرکردنی پۆلەندە و ئەلمانیایە.

* * *

بەشی پینجەم :

# مەزن

داگیرکردنی پۆلەندە بەلای چەکی ئەلمانیەوە وەك گەشتیك وابوو . دڕندەیی جەنگ هەموو هیزی فڕۆکەوانی پۆلەندی تێکشکاند بەبێ ئاگادار کردنەوە زۆربەی فڕۆکە پۆلەندیەکان لەسەر زەوی تیك شکینران .
کاتیك کە نۆرە هاتە سەر داگیرکردنی شاری ( وارسۆ ) پیش پیشڕەوی کردنی هیزی پیادەی ئەلمانی بۆ ئەو شارە لەلایەن هیزی ئاسمانیەوە بە شەپۆل تەقەمەنی درا بەسەر ئەو شارەدا بە مەبەستی خۆ بە دەستەوەدانی .
تەقەمەنیەکانی لە جۆری ( شتوکا ) بە شیوەیەکی ترسناك ئەو شارەی دەکوتا شایانی باسە لە دوای کۆتایی هاتنی ئەو هەلمەتە پیاوانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە ئامیری کامیرای ( فۆتۆ گراف و کامیرای سینەمای ) چونە ناو شارو دەستیان کرد بە گرتنی شوینەوار و کاولکاری ئەو تەلارە خاپورانەی کە جێی شانازی ئەو شارە بوون .
یەکەمین فلیم کە بوە پروپاگەندە بۆ هیزی ئاسمانی ئەلمانی بە ناوی ( یەکەمین کاولکاری بە ئاگر ) بوو لە پاش کۆتایی هاتنی فیلمەکە گۆرنگ لەسەر شاشە دەردەکەویت و دەلیت : ئەوەی کە بینەران بینیان هەمان چارەنوسە کە بەریتانیا چاوەڕوانی دەکات .
هەرکاتیك کە کێشەیەك دیتە پیش گۆرنگ هاوار دەکات لی گەڕین بۆ چەکی ئاسمانی ، دەگیڕنەوە کە گۆرنگ گفتی داوە بە هتلر کە گەر هاتوو تەنها فڕۆکەیەکی دوژمن توانی ئاسمانی ئەلمانیا ببەزینیت ئەوا پلەی خۆی دەکات بە ( مایر ) کە نزمترین پلەیە لە ئەلمانیادا شایانی باسە گۆرنگ ئەوەندە ژیا بۆ ئەوەی لەم وتەیە پاشگەز ببیتەوە .
بەڵام کاتیك کە پۆلەندە لەبەردەم هیزی ئاسمانی ئەلمانیادا وەك تەلاریکی لە کاغەز دروست کراو داڕما جیهان پێیان وابوو کە چەکی ئاسمانی ئەلمانیا نابەزیت و زەوی و ئاسمانی ئەلمانیا لە هەمووان قەدەغە دەکریت لە پاشان ئەلمانیا کە لکەلەی ئەورووپای کەوتە سەر بە بەریتانیاشەوە گۆرنگ لای خۆیەوە دەیوت ئەو کارە بسپیرن بە ( لوفتوات) لوفتواتیش پشتی بە بۆمبی دورهاویژ

دەبەست لەسەر کەوتنەکانیاندا بەڵام هتلر ناکۆك بوو بە کارهێنانی ئەم جۆرە چەکە و لە ئەلمانیادا بەرهەم هێنانی قەدەغە کرد .

لەپاش داگیرکردنی پۆلەندە بە پێی پەیماننامەکە لە نیوان ئەلمانیا و ڕوسیادا دابەشکرا . هتلر هەوڵی دەدا لەگەڵ هەریەك لە بەریتانیا و فەڕەنسادا ئاشتی نامە مۆر بکات بەڵام ئەم هەوڵە سەری نەگرت .

لە زستانی 1939 بۆ 1940 هتلر بانگیشتی و تویژی دەکرد بۆ گەیشتن بە ئاشتی لەم کاتەدا بزوتنەوەیەکی نهینی لە ئەلمانیادا دروست دەبیت لەبەشە ڕاست ڕەوەکان کە بریتی بوون لە سەرکردەکانی سوپا بە مەبەستی وتویژ کردن بۆ ئاشتبونەوە و پیك هاتنەوە و لە هەمانکاتدا کارکردن لە پیناو لابردنی هتلر لەسەر دەسەلات . لەم کاتەدا گۆرنگ خەریکی تیکەڵا کردنی ئابوری پۆلەندە بوو لەگەڵ ئەلمانیادا .

بۆ ئەم مەبەستە هەریمە ڕۆژئاواییەکانی خستە سەر دەسەلاتی ئەلمانیا بەم پێیە هەریمەکانی ناوەندی پۆلەندە بوە دەولەتیکی سەر بە ئەلمانیا و گۆرنگ بوە بەرپرسی گشتی ئەو دەولەتەو ئەویش واهلریشی سەر پشك کرد لە ئاسایش و پاکسازی ئەو هەریمانە لە ئەکتوبەری 1939 دا .

ئەنجا گەلی پۆلەندە لایان ئاشکرا بوو کە وەك گەلیکی کۆیلە سەیریان دەکریت . پیاوانیان لەو کارگانەری کە سەر بە هەریمەکانی ئەلمانیا بوون کاریان پێ دەکراو ڕەچەلەکی ئەلمانی لە شوین پۆلەندی نیشتەجێ دەکران و یەهودیەکانی گەلی پۆلەندە لە گەڕەکی تایبەت یاخود ڕاپیچ دەکران بۆ ئوردوگای زۆرە ملی و نیشتەجێ دەکران کە لە ناو پۆلەندەدا بۆیان ئامادە کرابوو لە ژیر چاودیری هیزەکانی پاسەوانی ڕەشدا بوون .

ئەم کارانە زۆر بە دڵا ڕەقی لە مانگەکانی زستانی 1939 بۆ 1940 ئەنجام دران شایانی باسە گۆرنگ لە هەموو ئەم کارانەدا بەشدار بووە بە بەلگەی بوونی ئیمزاکەی لەسەر هەموو فەرمانیکی تایبەت بەم کارانە .

لە نۆڤەمبەری 1939 دا گۆرنگ بەو پایەی سەرپەرشتیاری ئابوری ئەلمانیا بوو هەستا بە دەستنیشانکردنی ڕیژەی خواردن و جل و بەرگ بۆ گەلی ئەلمانیا و لە مارسی 1940 دا فەرمانیدا بە گەلی ئەلمانیا کە هەستن بە گیڕانەوەی ئەو کەل و پەلانەی لە ( نوحاس و برۆنز و تەنەکە ) و هەر جۆرە کانزایەکی بە کەلك دروست کراون بۆ کارگە حکومیەکان .

ئەنجا هتلر کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ داگیرکردنی ڕۆژئاوای ئەوروپا و گۆرنگیش چاوی بڕیبووە سامانی دەولتانی ( فەڕەنسا و بەلجیکا و هۆلندە ) هەر لەم پیناوەشدا هەستا بە دامەزراندنی ئەفسەرانی پسپۆڕ لە بواری ئابوریدا لە سوپادا بۆ ئەوەی لە کاتی داگیرکردنی هەر وڵاتیکدا بە خیرایی دەست بگیریت بەسەر کارگەو دامەزراوەکاندا و تیکەڵا کردنی بەڕەوڕەوەی ئابوری ئەلمانیا هەروەها دەست گرتن بەسەر ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی لە بواری جەنگدا بە کەلکن .

لە بەهاری 1940 دا هتلر هیرشەکەی بۆ سەر ڕۆژئاوای ئەوروپا ئەنجام دەدات و لە ( 9 ) ی ئەپریلدا سوپاکەی ( دانیمارك و نەرویج ) داگیر دەکەن و ئەو هیرشە تا کۆتایی ئەو مانگە بەردەوام دەبیت و لە (10 ) ی مایودا سوپای ئەلمانی ( بەلجیکا و هۆلەندە ) داگیر دەکەن و دەچنە خاکی فەڕەنساوە و جەنگ لە ڕۆژئاوا لە ( 14 ) ی مایودا کۆتایی پێدیت لە ساڵی 1940 دا .

هیچ زیانیکی ئەوتۆ بە هیزە ئەلمانیەکان نەکەوتبوو کە شایانی باسکردن بیت جگە لە چەند زیانیکی بچوکی ئاسایی هیزی دەریایی نەبیت. گۆرنگ شانازی بەو سەرکەوتنانەوە دەکرد کە لەلایەن هیزی ئاسمانییەوە ئەنجام درابوون بەڵام زوو زانی کە هتلر هیچ گرنگیەك بەو کارە نادات .

گۆرنگ نیگەران بوو بە دامەزراندنی جەنەراڵ ( فالکهورست ) لەلایەن هتلرەوە بە سەرکردەی هەلمەتیك بە داگیرکردنی چەند بەندەریکی نەرویجی بێئەوەی ڕای گۆرنگ وەربگریت .

( سمیر ویلز ) هەفتەیەکی لەگەڵ گۆرنگ لە کۆشکی ( کارین هول ) بەسەر برد سمیر ویلز نیردراوی ( روزفلت ) ی سەرۆکی ئەمریکا بوو کە لە مانگی مارسدا سەردانی ئەلمانیای کردبوو کۆشکی کارین هول لەلایەن گۆرنگەوە زۆر گرنگی پآ دەدراو بوبوە جیگەی سەرنجی هەموو ئەو کەسایەتی وخەلکانەی سەردانی گۆرنگیان دەکرد لەو کۆشکەدا کە تا بهاتایە لەلایەن گۆرنگەوە ڕوبەرەکەی فراوان دەکراو زەوی و زاری دەمدەدرا وای لی هاتبوو ڕوبەرەکەی خەریك بوو دەبوە هیندەی مۆزەخانەی ( هونەر ) لە واشنگتۆن سمیر ویلز زۆر سەرنجی خشلەکانی گۆرنگی دەدا بە تایبەت ئەو ( مستیلە گەورەیەی کە زمردیکی گەورەی لەسەرە قەبارەکەی یەك ئینج چوارگۆشە دەبوو ) جگە لە شەش مستیلەی دیکە کە هەریەکەیان ئەلماسیکی گەورەی لەسەرە

هەروەها سمرو یلز سەرنجیدا کە هاوڕییەتی کردنی گۆرنگ ناخۆش نییە و بە گۆرنگی ڕاگەیاندبوو کە جەنگ بە زیانی هەریەك لە بەریتانیا و فەرەنسا دەگەڕێتەوە و سەرکەوتن بۆ ئەڵمانیا دەبیت بە هۆی پیشکەوتویی هیزی ئاسمانیەوە .
لەلایەکی دیکەوە کەس لەو بڕوایەدا نەبوو کە هتلر لە مانگی ئەپریلی (1940 ) دا سەردانی ( پاریس ) دەکات لە گەشتیکدا بۆ حەوانەوە و بینینی پایتەختی فەرەنسا پاش ئەوەی کە بەر لە دوو مانگ لەو بەرەوارە لەلایەن سوپاکەیەوە داگیر کرابوو .
گۆرنگیش سەرکردایەتی گەورەترین هیرش ئاسمانی دەکرد لە میژوودا چونکە لە کاتی هیرشی ئەڵمانیا بۆ سەر رۆژئاوا ( 3500 ) فرۆکە بەشداریان کرد ، ئەم هیزە بووە جیگەی سەرسوڕمانی بەرگریکەرە هۆلەندیەکان لەلایەن بۆمبی ئەو فرۆکانەوە تەواوی شاری ( رۆتردام ) تیکشکینرا و نزیکەی ( 800 ) کەس تییدا بونە قوربانی و ویرای ئەوەی کە خۆی و سەرۆکی هیزی ئاسمانی ( کسلرنج ) دەیانزانی کە وتویژ هەیە لەگەڵ هۆلەندیەکاندا سەبارەت بە خۆبەدەستەوەدانیان پیش ئەو هیرشە .
هەروەها کاتیك کە هتلر داوای هیزەکانی زریپۆشی کرد لە پیش (دنکرك) ڕاوەستن گۆرنگ بە شانازیەوە وتی : هیزەکانی دەتوانن دوژمن لەناوبەرن بەبێ هاوکاری زریپۆش .
سەرۆکی ئەرکانی سوپا ( هملر ) لەم روەوە باسیکی بۆ ( ویلیام شیرر ) ناردبوو لە پاش جەنگ .
هتلر سوربوو لەسەر روبەڕوبونەوەی لەگەڵ بەریتانیەکاندا وە شکاندنیان . هەروەها گۆرنگ دەیویست زەبریکی پتەویان ئاڕاستە بکات .
بەڵام بەریتانیەکان سەرکەوتنیان بەدەست هینا لە دورخستنەوەی هیزەکانیان یاخود بەشیکی لە ( دنکرك ) چونکە بارودۆخی ئاو و هەوا نالەباربوو لە بەرژەوەندی کاری فرۆکەوان نەبوو جگە لەوەی کە بەرامبەرەکەی ، فرۆکە ئەڵمانیەکان بەهیزن ، دوورخستنەوەی ئەو هیزانە زۆری لە شەودا ئەنجامدرا و بە رۆژیش پشت بە دوکەڵی کەڵ و پەڵی سوتاو دەبەسترا کە ناوچەکەی داپۆشیبوو .

رۆژی ( 4 ) ی یونیو ( 1940 ) هیزە وشکانیەکان دەستیان بە پیشڕەوی کرد پاش شکست هینانی ئەرکی هیزی ئاسمانی .

لە ( 21 ) ی یۆنیودا لە هەمان ساڵدا گۆرنگ ئامادەی ئاهەنگی خۆبەدەستەوەدانی ( فەرەنسا ) بوو کە لە ( دارستانی کومبین ) ئەنجامدراو تیایدا گۆرنگ بەرزترین مەدالیای وەرگرت کە بەدەست هینانی پلەی ( مارشالی رایخ ) ی مەزن بوو هەروەها هەریەك لە پیاوانی ( میلش و سبریل و کسلریخ ) پلەی ( فیلد مارشال ) یان پیّ بەخشرا.

لە پاشان هتلر ویستی لەگەل بەریتانیادا پیك بیت بەڵام سەرۆك وەزیرانی نویّ ( چرچل ) لە ( 10 ) ی مایوی ( 1940 ) دا چووە سەرکار کە ڕێکەوتی ئەو رۆژە دەکات . کە بەلجیکا و هۆلەندە لەلایەن هتلرەوە داگیرکران ئەم داوایەی ڕەت کردەوە .

گۆرنگ گەیشتبووە لوتکەی بەرزی دەسەڵات و ناوبانگ و ناودارترین کەسایەتی ئەلمانیا بوو و جەماوەری لە جەماوەری هتلر زیاتر بوو بەڵام لە هیزدا ئەم ژمارەیە وەك هتلر نەبوو چونکە تاوەکو ئەو کاتە مانەوەی بەندە بە دلنیایی هتلرەوە لەلایەکی ترەوە بوبوە مایەی چاو تآ بڕین و بە زۆر زانینی هەرسیّ وەزیری ئەلمانی ( رینتروب و گوبلز و هملر ) بەڵام (هیس ) هەموو گرنگی دابووە چارەسەرکردنی بارودۆخەکە لەگەل بەریتانیادا و حەزی نەدەکرد پیشبڕکیّ لە پلە و پایەدا لەگەل کەسدا بکات .

هیس گرنگی دەدا بە داگیرکردنی ( روسیا ) و زۆری سەرکردەکانی سوپا بەچاوی ڕقەوە سەیریان دەکرد چونکە هەر سەرکەوتنیك ئەنجام بدرایە دەکرا بە ناوی ئەوەوە .

لە سالّی ( 1940 ) دا هتلر دەستی کردبوو بە نەخشەکیشان بۆ داگیرکردنی ( روسیا ) و گرنگی داگیرکردنی بەریتانیا کەم بوەبوە ، هتلر لە دەریا و سەرکەوتنی ئوستۆلی بەریتانی دەترسا بەسەر هیزی ئاسمانی ئەلمانیادا .

هەروەها هتلر پروپاگەندەکانی گۆرنگی بە دوور زانی کە دەیوت دەتوانیت بەریتانیا وا لی بکات وەك هۆلەندە خۆی بە دەستەوە بدات ئەویش بە تیکشکاندنی تەواوی فڕۆکە و فرۆکەخانەکان لەسەر زەوی بەهۆی هیرشی بەردەوامی هیزی ئاسمانی ئەلمانیا و لە کۆتایدا هتلر گۆرنگی بەرپرس کرد لە ئەگەری بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە .

چـونکە ئەو ئەرکەی کە بە ( شـێری دەریـا ) ناسـرابوو و تـایبەت بـوو بە داگیرکردنی بەریتانیا پیویستی بە بەشداری کردنـی هیزی دەریایی و ئاسمانی و وشـکایەکانی ئەلمانیـا بـوو ئەم کـارەش زەحـمەت و گیروگرفتـی خـۆی هەیە . هەروەهـا دەتوانریـت بەریتانیـا لاواز بکریـت لە ڕێـگەی تیکشـکاندنی هیـزی ئاسمانیەوە لە پاشان فەرماندرا بە هیرش کردنە سەر هیزی ئاسمانی بەریتانی لە ئاسمان و لەسەر زەوی و هەروەها هیرش کردنە سەر ئۆستۆلەکان لە بنکە و بەندەرەکانـدا لە رۆژی ( 2 ) ی ئەگۆسـت ( 1940 ) دا بەم شـیوەیە جەنگـی بەریتانیـا دەسـتی پیکـرد و گۆرنـگ لەنـاو شـەمەندەفەرەکەیەوە دەسـتی کـرد بەسەرکردایەتی کردن کە بەشیکی زۆری ناو شەمەندەفەرەکەی کردبووە جیگەی حەوانەوە بۆ خۆی و یاریدەدەرانی هەروەها ئەو کەسانەی سەردانیان دەکرد .

لە مـانگی سبتمبەردا گۆرنـگ بە هاوڕێیەتی خزمەتکاری تایبەتی خۆی و پزیشك و برین پیچ ( کریستا جورمـان ) سەردانی شەڕگەی کرد کە تاوەکو ئەو کات لە ( پاریس ) یاخود لە کارین هولەوە سەرکردایەتی جەنگی دەکرد شایانی باسـە کە جەنگـی بەریتانیـا بە سـەرەتایەك دادەنریـت بـۆ دابەزیـن و کەوتنـی گۆرنگ ، لەبەر دریژبونەوەی جەنـگ لە نیوەی ئەگۆستی ( 1940 ) بۆ نیوەی مایوی ( 1941 ) هەروەها لەگەل کەمیك هیور بوونەوەی جەنـگەکە لە زستاندا لە نیوەی ینایری ( 1941 ) بۆ مارسی هەمان ساڵ ئامانجی گۆرنـگ بریتی بوو لە رەوانەکردنـی ( 1000 ) فـرۆکە رۆژانە بـۆ سـەر بەریتانیـا کە پیویسـت بـوو بەشـیك لەو فڕۆکـانە شـەڕکەربن بـۆ بەرپەرچ دانەوەی فـرۆکە شـەڕکەرە بەریتانیەکـان هەرچەندە کە فرۆکەکـانی زۆر لە فرۆکە بەریتانیەکان پیشکەوتوتر و زیـاتربوو لە ژمـارەدا ، لەسـەر فـرۆکەوانە بەریتانیەکـان پیویسـت بـوو شـەو و رۆژ خەریکـی فرۆکەکانیـان بـن کە لە جۆرەکـانی (سبتفیر و شـتوکا و مسزشـمیدت ) بـوو لەگەل ئەوەشـدا و کەمـی ژمـارەی فرۆکەکانیـان توانیان سەرکەوتن بەسەر ئەلمانیەکاندا بەدەست بهینن .

لیرەدا ترس و دوودلی لە گۆرنگدا پەیدا بوبوو هتلریش رۆژانە بە تەلەفون پەیوەنـدی پیـوە دەکـرد بە مەبەسـتی رودانــی هەر پیشـکەوتنیك گـۆرنگیش بـۆ سەرکەوتنی ئەو بەلینەی دابووی بە هتلر رۆژانە ژمارەیەکی یەجگار زۆری لە فـرۆکە رەوانەی بەریتانیـا دەکـرد . بەڵام لە ناوەڕاسـتی سـبتمبەردا ( هتلـر ) ناچاربوو کە داگیرکردنی بەریتانیا دوا بخات .

ماوەیەك گۆرنگ بە دابڕاوی مایەوە پاش شكست هێنانی لە داگیركردنی بەریتانیادا و متمانەی لای هتلر لەدەستدا و ناوەندی سەركردایەتی و جەنگی جیهیشت بۆ ( جەنەراڵ – گاڵاند ) و پیاوانی فرۆكەوانی هەستیان بەبێ نازی دەكرد چونكە وەك گۆرنگ هیچ گرنگیەكی پێنەدەدان و گاڵاند یەكێك بوو لەو كەسانەی كە نەیدەویست بە هیچ كاریكەوە بەندبیت كە دەیزانی شكستی تیدا ئەندام درابیت ئەمەش یەكیك بوو لە هەرە هۆكارە عەیبدارەكانی سەردەمی جەنگ گاڵاند سێ رۆژی لە كارین هول لەگەڵ گۆرنگدا بەسەر برد لەوكاتەی كە هیزی ئاسمانی ئەلمانیا زیانیكی گەورەی لی كەوتبوو لەكاتی ئەم ئەنجامەی جەنگی بەریتانیادا گۆرنگ لای كرد بەلای داگیركردنی ( روسیا ) كە بەهاری (1941 ) ی بۆ دەستنیشانكراوە تا داگیربكریت .

ئەلمانیەكان چاویان بڕیبوە سامانەكانی ( ئوكرانیا ) و چاوچنۆكی هتلر بێ سنوربوو ، ئەم هەڵمەتە ( رۆمانیا و بولگاریا) شی گرتەوە و ئەلمانیا دەستی گرت بەسەر بیرە نەوتەكانی ( رۆمانیا ) دا .

بەڵام ( یوگسلافیا ) ئاشكرابوو كە گرتنی ئاسان نییە هەر بۆیە گۆرنگ بەرپرس كرا كە ( بەلگردا ) ویران بكات بە وینەی ( وارسۆ و رۆتردام ) .

شایانی باسە داگیركردنی ( بەلقان ) بووە هۆی دواكەوتنی داگیركردنی ( روسیا ) و لە كۆتایی ئەپریلی ( 1941 ) دا جەنگ دریژ بوەوە بۆ ( یۆنان و كریت ) . تیپە ( پەرەشوتەكان ) ی سەر بە هیزەكانی گۆرنگ ئەو دوورگەیەیان داگیركردبوو بەریتانیەكانیان لی وەدەرنا پاش ئەوەی زیانیكی گەورەیان پیگەیاندن .

هتلر توشی تەوژمیكی پتەوی نیگەرانی دەبیت كاتیك كە ( هیس ) بە فڕۆكەیەكی تایبەت لە ( 10 ) ی مایوی ( 1941 ) دا دەچیت بۆ بەریتانیا بۆ گەڕان بە دوای ئاشتیدا ئەویش پیش هیرش كردن بۆ سەر ( روسیا ) بە چەند هەفتەیەك كە هیرشەكەی سەر روسیا لە ( 22 ) ی یونیوی ( 1941 ) دا دەستی پیكرد . ئەركی گۆرنگ لە داگیركردنی روسیادا بەكارهینانی تەواوی هیزی ئاسمانی بوو لە زستانی ( 1940 ) بۆ بەهاری ( 1941 ) .

گۆرنگ هەستا بەدەركردنی فەرمانیك بۆ هیزەكانی چەكی ئاسمانی ئەلمانیا كە ئەمە دەقەكەیەتی :- ( جەنگ ناتوانریت بەردەوام بیت گەر بیت و لە روسیادا هیزی ئاسمانی تیروتەسەل نەكریت بە پشتبەستن بە سامانەكانی روسیا بە جەنگ

له ساڵی سیهەمیدا و گومانی تیدا نییه گەر بیت و پیویستی خۆمان له وڵاتدا بەرین ئەوا چەند ملیونیك له برساندا دەمرن ) .
له پاشان گۆرنگ هەستا بەداخستن و لەکارخستنی هەموو کارگە و پیشەسازیەکان له ( مۆسکۆ و لیننگراد ) له پیلانێکدا بۆ بڵاوەکردنی خەلکەکەی و چۆلکردنی هەردوو شارەکه بۆ گەڕان به دوای ناندا ئەم کاره و کاتی داگیرکردنەکه له پیاوانی فرۆکەوان شاردرایەوه و گاڵاند له مایوی ( 1941 ) دا بەم کارەی زانی و گۆرنگ پێی ڕاگەیاند که جەنگ له روسیادا هەلیکی رەخساوه بۆ ئەوەی هیزی ئاسمانی ئەلمانی متمانه و رەسەنایەتی کۆنی خۆی بەدەست بهینیتەوه و له هاویندا دەتوانریت بەریتانیا داگیربکریت پاش کۆتایی هاتنی هەلمەتەکەی سەر روسیا .
بەڵام گاڵاند دەیزانی که توانای هیزی ئاسمانی ئەوەندەیه که بتوانیت روبەڕوی جەنگ بیتەوه لەگەل بەهیزترین دوژمندا که یەکیتی سۆڤیەته له کاتیکدا که هەمان ئەو هیزانه له رۆژئاوای ئەوروپادا له ئیتالیا و باکوری ئەفریقا و بەلقاندا بڵاوبونەتەوه و لەلایەکی ترەوه فرۆکەوانەکان وا دەزانن که هەموو ئەرکەکانیان تەنها بەردەوام بوونی هیرشەکانیانه بۆ سەر بەریتانیا .
سەرەتای چەند سەرکەوتنیك لەروسیا دا هتلر پشت ئەستور کرد بەرامبەر سوپاکەی و هیزی ئاسمانی و بەریتانیا بەلایەوه وەك ئەرکیکی راپەڕیوی لیهاتبوو .
سەرنجی گۆرنگ چوو بووه لای گەنمەکەی ( ئۆکرانیا ) و پیشنیاری بۆ هتلر کرد که دارستان و زەویەکانی ( بیالیستوك ) لەسەر کەناری (بالتیك) بخریته پاڵ ( بلاروسیا ) ی رۆژهەڵات چونکه ناوچەیەکی گرنگه بۆ ڕاو.
له پاشان باس له بارەگاکانی تایبەت به هتلر کرا ( قرم و قۆقاز ) و بیره نەوتەکانی ( باکۆ ) هەروەها به مەبەستی کەمکردنەوەی ریژەی دانیشتوان له شاره روسیەکاندا دەتوانریت پشت به هیزی ئاسمانی ببەستریت .
لەلایەکی ترەوه گۆرنگ بەرپرسه له دەرکردنی فرمانی قەڵاچۆکردنی (یەهود ) یان چاسەرەسەرکردنی یەکجاری کێشەی یەهود که لەلای هتلر به ئەرکێکی پیویست دادەنرا گەر بیەویت ڕەچەلەکی ڕەگەزی ( ئاری ) تەشەنه بکات و بڵاوبیتەوه بەرەو رۆژهەڵات زۆر هۆکار و رێ و شوین گیرانه بەر بۆ کەمکردنەوه و لەناوبردنی روس و یەهود لەوانه برسی کردن ، کاری گران و

زەحمەت پێیان تاکو ئاستی مردن و کوشتنی بە کۆمەل . لە ماوەی ساڵی ( 1941 ) دا لەلایەن تیپەکانی پاسەوانی رەشەوە بە هەزاران لە دانیشتوانی روسی و یەهود لە سیدارە دران لە پشت شەرگەکانەوە بەڵام ناوەندی سەرەکی لەسیدارە دان لە ( پۆلەندە ) دامەزرابوو لەناو ئۆردوگا و گرتوخانەکاندا کە بەناوبانگترینیان ئۆردوگای ( ئشویتز ) بوو کە ( هیدرش ) ی جیگری یەکەمی ( هملر ) سەرپەرشتی ئەم هەلمەتەی دەکرد و گۆرنگ ئەم فەرمانەی لە ( 31 ) ی یولیوی (1941) بۆ دەکرد کە ئەمە دەقەکەیەتی :-

( پاڵپشت بە فرمانی دەرکراو بۆت لە ( 24 ) ی ینایری ( 1939 ) دا تایبەت بە چارەسەرکردنی کێشەی یەهود لە ڕێگەی گوێستنەوە و کۆچ پی کردن بە باشترین شیوە لەم کاتەی ئیستادا . فەرمانت پێدەکەم کە ئامادەبونی تەواو وەربگریت لەرووی خەرجی و ریکخستنەوە بە مەبەستی چارەسەری کۆتایی کێشەی یەهود لە هەموو ئەو ناوچانەی دەکەونە ژیر دەسەڵاتی ئەلمانیاوە لە ئەوروپادا و پیشکەشکردنی راپۆرتیك لەو ڕوەوە لە نزیکترین فرسەتدا ) .

لەو ساڵەدا هەموو ئەو فرمانانە ئاماژەیان بۆ توندڕەوی دەکرد کە لە بارەگای سەرکردایەتی گۆرنگەوە دەردەکران و لە دادگای ( نورمبرگ ) دا پشت بەو فرمانانە بەسترا بۆ تاوانبارکردنی گۆرنگ شایانی باسە کە ئەو بەلگەنامانەی لە ( فایلی سەوز ) دان تاوان و توندڕەوی و بێ بەزەیی دەسەڵاتی هتلری نیشان دەدەن لە پیناو دەستگرتن بەسەر ئەوروپادا . لە سبتەمبەری ( 1941 ) دا بەرگری روس روو لە پتەوی بوو و وەرزی زستانیش لەسەر ڕێ بوو لەم کاتەدا ناوبانگی گۆرنگ لە ئەلمانیادا کەوت چونکە بڵاوبونەوەی هیزی ئاسمانی ئەلمانیا بە شەرگەیەکدا کە دریژدەبوەوە بۆ باکوری ( ئەفریقا و فەرەنسا ) ڕێگەی خۆش کرد تا فرۆکەکانی هیزی ئاسمانی بەریتانیا چەند هیرشیك بکەنە سەر ئەلمانیا .

گۆرنگ پەنجەی گەست کە وتبوی ئاسمانی ئەلمانیا دوور دەبیت لە فڕۆکەی دوژمن هەرچەند ویستی ئەم هۆیە بخاتە سەرشانی یەکەی بەرگری زەوی و بە سەرقالی هیزی ئاسمانی ئەلمانیا لە شەرگەکاندا پاساوی بۆ ئەم کارە دەهینایەوە .

لە ئەنجامی سەرکیشیەکانی گۆرنگ ( جەنەرال ئاودت ) خۆی دەکوژیت کە گەورە یاریدەدەرانی خۆی بوو ( ئاودت ) یەکیك بوو لە پاڵەوانانی جەنگی یەکەمی جیهانی کە ( 54 ) فرۆکەی هاوپەیمانانی تیکشکاندبوو لە هەمان مانگدا

جەنەرال ( مولدر ) دەکوژریت بەهۆی کەوتنە خوارەوەی فرۆکەکەی ( مولدر ) سەرکردەی هیزی چەکی شەڕکەر بوو لە جیگەی جەنەرال ( گالاند ) دانراو ئامادەی روبەڕوبونەوە بوو لەگەڵ گۆرنگدا .

بەڵام هەموو ئەم نەهامەتیانە کاریان لە گۆرنگ نەکرد کاتیك کە کۆنت ( شیانۆ ) وەزیری دەرەوەی ئیتالیا لە نۆڤەمبەری ( 1941 ) دا سەردانی بەرلین دەکات گۆرنگ بە زەردەخەنەیەکەوە پێی دەڵیت :-

( ئیمە ناتوانین خۆمان خەریك بکەین بە برسیتی یۆنانەوە . چونکە ئەم کارە بێ شانسی دەگەیەنیت کە زۆر لە هاورییانیان توشی هاتوون لەگرتوخانەکاندا لە روسەکان و دیلەکانی جەنگ ئەو دیلانە تەنانەت پێڵاوەکانی خۆشیان لەبرساندا خواردووە و ئیستا یەکتری دەخۆن لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە پاسەوانیکی ئەلمانیشیان خواردوە . ئەمساڵ لە روسیا لە برساندا لە نیوان ( 20 – 30 ) ملیۆن کەس دەمریت لە دانیشتوان کە ئەمەش کاریکی باشە بۆ لەناو بردنی هەندێک لەو میللەتانە و دەسەڵاتیش نییە ، وە گەرهاتوو برسیتی خۆی سەپاند ئەوا دوا میللەت کە کۆتایی پی دیت گەڵانی هەردوو لامانە ).

گۆرنگ لە ( 1942 ) دا سەردانی ئیتالیا دەکات و گومان پەیدا دەکات پاش ئەوەی کە ( ئەمریکا ) دەکشیتە جەنگەوە لە دژی ئەلمانیا .

بەڵام ( شیانۆ ) هەلسوکەوتی گۆرنگی بەلاوە سەیربوو ویرای فیز و شانازی کردنی بەخشل و زیر و زیوەکانیەوە ، شیانۆ وتبوی پیم ڕاگەیاندراوە کە گۆرنگ حەز لە یاری کردن بەخشل و زیر و زیو دەکات هەروەك چۆن مندال یاری بە بولبول دەکات لە ماوەی گەشتەکەی بۆ ئیتالیا گۆرنگ یەجگار نیگەران و هیلاکی باری دەرونی پیوە دیار بووە بەڵام پاش ئەوەی لەلایەن چەند ئەفسەریکی یاریدەدەریەوە سنوقیك خشل و زیر و زیو دەخریتە بەردەمی کە پڕ بووە لە یاقوت و ئەلماس و بەردی بە نرخ گۆرنگ دەستی کردووە بە یاری کردن پێیان و تیکەل کردنیان لەگەڵ یەکتری و لەیەك جیاکردنەوەیان و چاوتێ بڕینیان ، بەم شیوەیە هاتۆتەوە سەرخۆی و باری دەروونی حەواوەتەوە بە تەواوی ، یەکیك لە گەورە یاوەرانی وتبوی دوو ئارەزوی هەیە کە بریتین لە هلگیرساندنی جەنگ و کۆکردنەوەی هەموو شتیکی بە نرخ هەروەها حەزی بە لەبەرکردنی ( جبە و قاپوتی دریژ دەکرد بە جۆریکی هیند دریژ کە زۆرجار لە زەوی دەدا ) .

لە ( 1942 ) دا هتلر ( ئەلبرت شبیر ) ی کردە وەزیری چەکسازی و بەم شیوەیە ڕێگرێکی نوێ بۆ گۆرنگ دروست بوو ( شبیر ) لە یاداشت نامە تایبەتەکەیدا باسی ئەلمانیای کردووە و نوسیویەتی :-

( گۆرنگ وەك من ئاگادار بووبم هەموو راستیەکانی دەزانی بەڵام خۆی لی هەلە دەکرد وەك بازرگانیکی بێ پارە هەلسوکەوتی لەگەل بارودۆخەکەدا دەکرد هەر ئەم جۆرە هەلسوکەتەی بوو کە بوە هۆی پاڵ پیوەنانی سەرکردەی یەکەمی چەکی فرۆکەوانی ( ئارنست ئاودت ) خۆی بکوژیت ساڵی ( 1941 ) .

هەروەها لە ( 18 ) ی ئەگوستی ( 1943 ) دا یەکیك لە نزیکترین هاوکارانی لە نوسینگەی تایبەتی خۆی بە کوژراوی دۆزرایەوە کە جەنەرال ( جاشوفیك ) بوو کە بۆ ماوەی چوارساڵ لەسەر یەك سەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو ، ئەویش لەسەر ڵاساری گۆرنگ خۆی کوشتبوو (میلیش) پێی ڕاگەیاندم کە نوسراویك لەسەر میزەکەی دۆزرابووەوە تیایدا (جاشۆفیك ) داوای کردبوو گۆرنگ نەچیتە سەر تەرمەکەی بەڵام لەگەل ئەوەشدا گۆرنگ ئامادەی مەراسیمی ناشتن دەبیت و بە ناوی هتلرەوە دەستەیەك گول لەسەر گۆری دادەنیت .

بێ بایەخی و گوێ پێ نەدان بە زۆرشت بوبووە پیشەی گۆرنگ و لەم روەوە ( والتر شولنبرگ ) سەرۆکی مخابەرات لە بەڕیوەبەرایەتی ئاسایشی رایخ کە سەر بە هملر بوو دەلیت : لەو ماوەیەدا گۆرنگ هەموو گرنگیەکی بە جەنگ پشتگوێ خستبوو خەریکی ژیانی ئاساییی و رابواردن بە دەولەمەندیەکەیەوە بوو . هملریش گۆرنگی بە ( پادشای بازاڕی ڕەش ) لە قەڵەم دەدا .

( گوبلز ) هاوڕێیەتی لەگەلدا هیشتبوەوە چونکە لە هەمووان زیاتر و باشتر گۆرنگی دەناسی کە لەژیر ئەو قەلەوی و چەوریەدا چ دڕندەیەکی فیل باز خۆی مەڵاس داوە .

لە ساڵی ( 1942 ) دا ئەلمانیا بە هەزاران هیرشی فرۆکەی دەکرایە سەر و چەرخی جەنگ بە باشی نەدەسوڕا لە ئەکتۆبەری هەمان ساڵدا دەنگوباسی شکست هینان لەمەیدانی جەنگدا لە ئەفریقیا بیسترا و لە زستاندا روداوی ( ستالینگراد ) رویدا کە سوپای ( 6 ) ی ئەلمانی بوو و ژمارەیان ( 250 ) ملیۆن

سەرباز بوو هەموو خۆیاندا بە دەست روسەوە لە کۆتایی ینایری ( 1943 ) و لە نوڤەمبەری هەمان ساڵدا هیزە ئەمریکیەکان لە باکوری ئەفریقیا دابەزین .

کاتیك کە هیرش دەکریتە سەر شاری ( پۆلۆنیا ) لەلایەن ( 1000 ) فرۆکەوە گۆرنگ لە کۆشکی تایبەتی خۆی ( فالدن شتاین ) دەبیت هتلر دەنیریت بەدوایدا و هەلویستی خۆی بە راشکاوی لەمەڕ هیزی ئاسمانی ئەلمانیا بە گۆرنگ رادەگەیەنیت .

فرۆکە ئەلمانیەکان شکست ئەهینن لە داگیرکردنی ( ماڵتە ) دا کە بە خۆراگری مایەوە لەبەردەم هیرشەکانیاندا لەلایەکی ترەوە گۆرنگ زیاتر تووشی کەنار گیری هات کاتیك کە فرۆکەکانی نەیان توانی یارمەتی فریای سوپای ( فۆن پاولدش ) بخات لە ( ستالینگراد ) کە لەوەپیش بەلینی پێدابوو هەروەك چۆن نەیتوانی یارمەتی فریای هیزەکانی (ئەفریقیا) بخات.

گۆرنگ لە ئاست ئەم کیشانە ئاسای بوو ( رۆمل ) دەربارەی گۆرنگ وتبوی ( لە پێشترین دوژمن ئەو کات گۆرنگ بوو ) .

چونکە لەو کاتەی کە ڕۆمل و خیزانەکەی لە فرۆکەیەکدا لەگەل گۆرنگدا دەبن گۆرنگ سەرنجی خیزانەکەی بەلای خۆیدا رادەکیشیت بە پیشکەشکردنی مستیلەکانی دەست و پێی و باسکردنی کۆشك سامانە بەنرخەکانی .

بەڵام خیزانی رۆمل گویی بەم هەڵسوکەوتانە نەدەدا و بەردەوام لە داڵغەی ئەوەدا بوو کە گۆرنگ چۆن نەیتوانیوە هیچ جۆرە یارمەتیەك فریای هاوسەرەکەی بخات بەم شیوەیە هاوسەرەکەی توشی تەنگوچەڵەمە دەبیت هەروەها بەلای ئەو خانمەوە سەیر بووە کە پیاویکی لەو ئاستەدا و بەرپرس و دووەم کەسی دوای هتلر گوێ بە رووداو و ئاکامەکانی جەنگ نادات .

لە کاتیکدا کە سوپای ئەلمانیا لە ( ستالینگراد ) تیکدەشکینرا گۆرنگ سەرقالی سازکردنی ئاهەنگیکی گەورە بوو لە ( بەرلین ) کە ساڵانە ئەنجامی دەدا ئەویش ئاهەنگی یادی رۆژی لەدایکبوونی بوو لە ینایری (1943) دا .

بریکی زۆر لە دیاری و تابلۆی گران بەهای پیشکەشکرا هەر لەو مانگەدا هیرشی رۆژانەی ئاسمانی ئەمریکی بۆ سەر ئەلمانیا دەستی پێ کردوو بەریتانیەکانیش شەوانە هیرشیان دەکردە سەر ناوەندە پیشەسازیەکان .

فرۆکەوانانی ئەلمان لە تۆلەدا زیانی گەورەیان بە دژومنان گەیاند بەڵام پیویستی تەواو لەبەردەم ئەمریکادا بوو ، وەك ئەلمان نەبوو هیزەکانیان

بڵاوبوبوونەوە لە نیوان روسیا و ئیتالیا و و دەریای سپی و بەلقان و باكوری ئەفریقیا جەنەرال گالاند دوو دلی دایگرتبوو بەهۆی كەمی فرۆكە و فرۆكەوان و پیداویستی هەر بۆیە هەوڵیدا پیشەسازی ئەلمانیا هەوڵبدات بریكی زیاتر لە فرۆكەی شەڕكەر دروست بكات بە ڕیژەی ( 4 – 1 ) بەڵام هتلر ئەم پیشنیارەی ڕەتكردەوە .

بارودۆخەكە زیاتر روو لە خراپی بوو كاتیك كە هاوپەیمانان ( سەقلیە و ئیتالیا ) یان داگیركرد .

هەربۆیە گۆرنگ بە پیویستی زانی لەبەرچاو ون بیت و لە مەیدانی جەنگ دوور بكەویتەوە لە ئەنجامی ئەم كارەیدا پروپاگەندە بڵاوبوەوە كە گوێیە گۆرنگ گەراوەتەوە بۆ وەرگرتنی بابەتە هۆشبەرەكان .

گۆرنگ لە دادگای ( نۆمبرگ ) دا ڕایگەیاند كە ( تاوەكو سەرەتای ساڵی ( 1942 ) من بەلای هتلرەوە گرنگ بووم و دووەم كەس بووم بەڵام لەو بەرواره تاوەكو ساڵی ( 1943 ) ئەم گرنگیە روو لە كەمی بوو تا گەیشتە نزمترین ئاست ) . وە وتبوی كە بڕوا ناكەم هیچ كەس وەك من نەبوە دوای من ( گوبلز ) دیت كە هەمیشە پەیوەندی لەگەل هتلردا توندوتۆل بوو ناو بەناو تیكدەچوو بەڵام زۆر گەرم بوو تا كۆتایی و دوا ساڵی جەنگ .

گۆرنگ بە بیانوی نەخۆشیەوە ماوەیەك خۆی دوور ڕاگرت بەڵام هتلر دەست بەرداری نەبوو چونكە مانەوەی پیویست بوو بۆ پاراستنی هەیبەتی یاسا لە ئەلمانیادا گۆبلز لە یاداشت نامە نهینیەكەیدا لە ساڵی (1943) نوسیویەتی كە هتلر پێی ڕاگەیاندوم ( گۆرنگ لەبەرچاوم وەك جاران نەماوە بەڵام دەسەڵاتی پیویستە بۆ سەركردایەتی كردنی ( رایخ ) بە هیچ جۆریك گۆرنگ خانەنشین نەدەكرا . زۆرجار هتلر بانگی دەكرد بۆ ئامادەبون لە كۆبونەوەكانیدا ، بەڵام گۆرنگ خوی دابوە كۆكردنەوەی تابلۆ بە نرخ و دانسقەكان تا وای لیهات ژمارەی تابلۆكانی گەیشتبوە (1500) تابلۆ كە نرخەكەی لە ( 60 ) ملیۆن ( جونەیهی ئیسترلینی ) زیاتر بوو .

گۆرنگ زیاتر گرنگی دەدا بە وینە كێشەكانی سەدەی حەڤدە هەم بە تایبەت تابلۆی دیمەنە سروشتیەكانی هۆلەندیەكان هەروەها وینە و تابلۆی هونەرمەندانی ئەلمانی سەدەی شازدەهەم كە بریتی بوون لە كۆمەلە تابلۆكانی هونەرمەندان ( روفیز و دینوێر و فان كوخ و جوجان و بیكاسۆ و لۆكاس و كرافاك ) ی گەورە

و بچوك كە دەیوست مۆزەخانەیەك بنیاد بنیت بۆ پیشاندانی وینە و تابلۆكانی و دژایەتی هتلر بكات كە ئەویش دەیوست لە شاری ( لینز ) مۆزەخانەیەك بۆ تابلۆكانی بنیاد بنیت .

گۆرنگ چەند تابلۆیەكی كەمی لە گیرفانی خۆی كڕیبو لەوانە تابلۆیەكی هونەرمەند ( فیرمیر ) ، باقی تابلۆكانی تر لەلایەن كۆمپانیا و پیاوانی دەولەتەوە لە ڕێگەی دیاریەوە پآی گەیشتبوو هەروەها لەكاتی جەنگەكاندا دەستی گرت بەسەر ریژەیەكی زۆر لە تابلۆكانی یەهود و پۆلەندی و بەلجیكی و هۆلەندی و فەرەنسیەكان كە بە هاوكاری لەگەل هتلردا بەشیان كرد و بەشیكی كەمیش خرانە ناو مۆزەخانە و پیشانگا هونەریەكانی ئەلمانیاوە لە پاش تیپەربوونی ساڵی ( 1934 ) ( موسولینی ) لە ئیتالیا دەكەویت و هیزەكانی هاوپەیمانان لە ( ئەنزیو ) دادەبەزن و هیزی ئەلمانی لە هاویندا لە ئیتالیا كشایەوە لەلایەكی ترەوە هیرشی ئاسمانی بۆ سەر ئەلمانیا زیاد دەكات و هیزی ئاسمانی ئەلمانیش هیچی بۆ ناكریت بەهۆی سەركەوتنی هاوپەیمانان لە رۆژهەلات و رۆژئاوا و باشورەوە .

( ئەلبرت شبیر ) ی وەزیری چەكسازی پیشكەوتنیكی بەرچاو ئەنجام دەدات لە پیش بەرهەمهینانی فرۆكە ویرای هیرشی ئاسمانی دوژمنان بۆ سەر ناوچە پیشەسازیەكان بەرهەمی فرۆكە دروست كردن گەیشتبوە (3000) فرۆكە مانگانە لە بەهاری ساڵی ( 1944 ) دا بەڵام ( گاڵاند ) سوربوو لەسەر زیاتر كردنی فرۆكەی شەڕكەر ئەم كارە وایكرد كە گۆرنگ لەگەل هتلردا لەو بارەیەوە وتویژ بكات لە كۆتاییدا .

گۆرنگ بە نیگەرانی و بآ هیزی لە كۆبونەوەكەی لەگەل هتلر دەردەچیت كە چاوی پڕ بوە لەئاو چونكە هتلر بە دەنگی بەرز ئەو داوایەی ڕەتكردۆتەوە و داوای لە گۆرنگ كردبوو كە گرنگی بدریت بە زیاتر لیدانی ( ئەنگلتەرە ) بە موشەك و داوایكرد كە فرۆكەی هەوایی لە جۆری (مسز شمیدت ) كە توانای ئاڕاستە كردنی موشەكی هەیە پەرەی پێبدریت.

بەم شیوەیە ریژەی فرۆكەی شەڕكەر كەم بووەوە بە( 7 ) فرۆكەی هاوپەیمان بەرامبەر ( 1 ) فرۆكەی ئەلمانی . لە زستانی ( 1944 – 1945 ) دا گۆرنگ هەوڵیدا بگەریتەوە مەیدانی سیاسەت لەسەر فرمانی هتلر بۆ ئەم مەبەستە دەست دەكات بە خویندنەوەی وتار و بەشداریكردن لەو كۆنگرە

سەربازیانەدا کە هتلر سازی دەکرد هەروەها هەستا بە سەردانی شەڕگەی ڕۆژئاوا بەڵام ئەم کارانە کاتی بوون چونکە لە پاشان هتلر دەست دەگریت بەسەر بارودۆخەکەدا ڕاستەوخۆ بەسەر سەرکردایەتیەکاندا فەرمان دەدات بە شەڕگەکان کە ئاکامەکەی بێ سەرەو بەرەیی ڕودەدات و کەس لە کەس حالی نابیت .

بە پێی قسەی گاڵاند تەنها ( 100 ) فرۆکەی شەڕکەر بەر لە هیرشی هاوپەیمانان دەگرن بۆ داگیرکردنی کەنارەکانی ( نورماندی ) بەڵام هیزی ئاسمانی ئەمریکی و بەریتانی دەست دەگرن بەسەر ئاسمانی جەنگەکەدا و فرۆکە شەڕکەرەکانی ئەلمانیا لە دووەم ڕۆژی داگیرکردنەکەدا دەخالەت دەکەن لە جەنگەکەدا .

ئەلمانیەکان هیوایان بە موشەکی ئاسمانی لە جۆری ( F1 ) بەڵام لەلایەن فرۆکە و دژە ئاسمانی بەریتانیاوە چالاکانە ئەم موشەکانە پیش لە زەوی دانی تیکدەشکینران هەرچەندە کە بەشیکی زۆر لەو موشەکانە گەیشتبونە ( لەندەن ) و زیانی گەورەیان دابوو لە نیوان یونیو و یولیوی (1944 ) دا لە ( 20 ) ی یولیودا ئەو بۆمبە دەتەقیتەوە کە کۆنت کولونیل (شتونبرگ) لە ژیر ئەو میزەدا جیگیری کرد بوو لە هۆلی کۆبونەوەی هتلر لە بارەگای سەرکردایەتی لە ( بلاروسیا ) ی ڕۆژهەڵات بەڵام هتلر تەنها بە سوکی بریندار دەبیت کاتیك کە گۆرنگ هەوالەکە دەبیستیت لەگەل چەند سەرکردەیەکی کەدا دەگەنە لای هتلر و بەشداری لە ئاهەنگی چا خواردنەوەدا دەکەن کە هتلر لە ڕیزی ( موسولینی ) دا سازی کردبوو لە پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا . لەسەر میزی چا خواردنەوەکە پیاهەلیژانیك لەنیوان رینتروب و گۆرنگدا ڕودەدات کە خەریك بوە بە دەست لە یەکتری بدەن و هەریەکەیان ویستویەتی دلسۆزی خۆی پیشانی هتلر بدات .

لە پاشان هتلر بەلین بە ( هملر و گۆبلز ) دەدات کە بەرپرسانی ئەو کارە دەدۆزیتەوە و سزایان دەدات لە دوا مانگی جەنگدا هتلر درکی بەو ڕاستیە کرد کە چیتر ناتوانیت داوا لە هیزەکانی بکات ئەرکی گران و نا ئاسایی ئەنجام بدەن .

لە ینایری 1945 دا گۆرنگ دەستبەرداری زەویەکانی بلاروسیای ڕۆژهەڵات دەبیت کە بۆ ڕاوشکار بەکاری دەهینان بەهۆی هەڕەشەی کشانی هیزی ڕوس و نزیکبونەوەیان لەو ناوچانەو , هەروەها هیتلەریش دەستبەرداری

بارەگـای سـەرکردایەتیەکەی لەو نـاوچەیە دەبیـت روسـەکان دەگەنە نـزیکەی ( 100 ) میـــل لە دووری ( بەرلـــین ) ە وە جەنەراڵ ( کـــۆلر ) بە تونـــدی سەرزەنشـــتی گـــۆرنگی کردبـــوو بەهـــۆی گـــوینەدانی بە بـــارودۆخەکە و دورکەوتـــنەوەی ســـاڵیکی تەواو لە چەکـــی ئاســـمانی کە تەنهـــا بە تەلەفـــونیش پەیوەندی پیوە نەکردون . پاشان لەسەر گۆرنگ پیویست دەبیت کە دەستبەرداری کۆشـکەکەی ( کـارین هـول ) بیـت پـاش ئەوەی هەمـوو کەلـوپەل و تابلۆکـانی دەگویزریتەوە بۆ باشوری ئەلمانیا لە ڕێگەی شەمەندەفەرەوە و خیزانەکەی لە ینـــایری 1945 دا کۆشـــکەکە جیـــدەهیلت ، بەڵام گۆرنـــگ تـــا دوا چـــرکە لە کۆشکەکەدا مایەوە لە ترسی هیتلر هەرچەندە جینشینی هیتلر بوو بەڵام هەستی بە مەترسـی دەکـرد لەلایەن هیتلـرەوە چونکە گۆبلز چـاوی بریبوە جیگەکەی ئینجـا گۆرنـگ ئامـادەی دوا کۆبـونەوە بـوو لەگەل هیتلـردا ، لەپاشـان دەچیـتە باشـور و خـۆی لە مەترسـی یەکـانی جەنـگ دوور دەخـاتەوە لە کاتیکدا هیتلرخۆی لە ژیـر زەمینەکـــانی بارەگـــای راویژکـــاران زینـــدەبەچال دەکـــات . گۆرنـــگ لە پـــاش جیهیشتنی کـارین هـول چەنـد کەسیکی لە پینـاوی خـۆی بەرپـرس کردبـوو لە تەقانـدنەوەی کۆشـکەکە لەگەل نزیـك بـوونەوەی روس . گۆرنـگ بـۆ دواجـار کە هتلری بینی رۆژی ( 20 ) ی ئەپرلـی 1945 بوو کە یـادی رۆژی لەدایکبونـی بـــوو لەپـــاش کۆتـــای هـــاتنی ئـــاهەنگەکە بە ئوتومبیـــل بەرەو ( بریخســـتگادن ) کەوتەڕی لە ڕەویکـی بە کـۆمەلی بەرپرسـانی ئەو شـارە ئەو کـاتە بەرلـین نـیمچە ئـابلوقەدراو بـوو زۆر بە زەحمەت دەتـوانرا ئەو شـارە جیبهیلریـت بەهـۆی چـڕی هیرشــــی ئاســــمانیەوە . بەڵام هتلرچـــۆلکردنی بەرلینــــی رەتکـــــردەوە و تەواوی نیگەرانــی و تــوڕەیی خــۆیی بــاران بەســـەر یاریـــدەدەرانی گۆرنگـــدا لە هیـــزی ئاسمانی بەهۆی شکست هینانیان لە بەر گرتن لە هیرشی ئاسمانی هاوپەیمانـان بـۆ سـەر بەرلـین گۆرنـگ هتلـری بە لەنـاوچوو لەقەڵەم دەدا لە بەرلـین و بەو پێیەی کەجـی نشـینی هیـتلەرە دەیویسـت وتـویژ ئەنجـام بـدات لەگەل هاوپەیمانـان بە مەبەسـتی ئاشـت بـوونەوە لە پاشـان جەنەراڵ ( کـارل کـولر ) دەچیـتە باشـوور رۆژی ( 23 ) ی ئەپریل و پەیوەندی دەکات بە گۆرنگەوە و پێـی دەلیت گـویی لـی بـووە ( هتلـر بە هەریەك لە مارشـال کیتـل و کولونیـل جەنەراڵ گـودلی وتـوە کە گۆرنـگ بەرپرسـە لە هەرجیگەیەك بیت لە کاروباری ئەو ناوچەیە کە لییەتی و هەرکاتیك وتویژ پیویست بوو ئەوا ئەو واتە

گۆرنگ لە من بە تواناترە ) . کاتیك ئەو هەواڵە بە گۆرنـگ دەگـات زۆر بەلایەوە سـەیر دەبیـت بـۆ زیـاتر دلنیـابوون لەسـەر ئەم هەواڵە هەلدەسـیت بە نـاردنی بروسکەیەك بۆ هتلر و لەرێ رادیوە بروسکەکە بە هتلر دەگات کە بریتـی بوو لە (گەورەم , لەبەرئەوەی ئیـوە بڕیارتـان داوە لە قەلای بەرلـین بمیننـەوە ئایـا قایـل دەبـن وەك جیگریکـی ئیـوە بە پیـآ بریارتـان لە بەرواری ( 29 ) ی 1941 کە سەر پشك بم بەکارکردن لە نـاوەوە و دەرەوە کە هەر ئیستا سـەرۆکایەتی ( رایخ ) بگرمە دەست . ئەگەر تـاکو کـاتژمیر ( 10 ) ی شـەو وەڵامـم پـی نەگـات ئەوا کار بەو بریارەتان دەکەم لە پیناو بەرژەوەندی گەل و نیشتمان ) . گۆرنـگ داوای لە ( رینتروب و کایتل ) کرد کە بـگەنە (بریخستگادن) بـۆ چاوپیکەوتن لەگەلیـان گەر هتلر ئەو بڕیارەی هەلنەوەشاندەوە . لەپاشـان خـۆی ئامـادە کرد بـۆ چونە نـاو وتویژ لەگەل , جەنەرال ( ئایزنهاوەر ) و بیری لە پیکهینـانی وەزارەتیکـی نـوێ دەکـردەوە . کاتیـك ئەم بروسـکەیە بە هتلـر دەگـات زۆر تـوڕە دەبیـت و (مـارتن بورمـان ) یـش زیـاتر خـویی پیـوە دەکـات لای هتلـر و پێـی دەلیـت : گۆرنـگ لەدەسـەڵاتی کەمکـردویتەوە و بەم هەواڵەی ئیـوەی بە لادراو لەسـەرکار لە قەڵەمداوە . لە پاشان هتلر بە فەرمانیك گۆرنـگ لە هەموو دەسـەلاتیك دەخات لە دەولەتدا و لە بروسکەیەکدا بە گۆرنـگ دەلیت :

( بڕیـاری دەرچـوو لە ( 29 ) ی ئەپریلـی 1941 هەلوەشـاوەتەوە لەسـەر ئامۆژگـاری تـایبەتی خـۆم سەربەستم لە هەموو کاریکدا و ڕێگەت نـادەم لە هەر هەنگاونانیکدا لەو باسـەی کـردوتە .. ئەدولف هتلر ) . (شبیر) لەو کـاتەدا لەگەل هتلـردا بـووە باسـی لەوە کـردوە کە چـۆن هتلـر تیکچـووە بە بیسـتنی ئەو هەواڵە نیشـانەکانی بیزاری لە روویـدا بینـراوە و لە تـوڕەیی خۆیـدا وا هەسـتی دەکـرد کە کەسی لە دەور نییە وە دەیوت ( من دەمزانی کە وایە بە دریژای کـات و دەمزانـی کە گۆرنـگ تەمەل و پیسـە هیـزی ئاسـمانی بە شـیوەیەك جیهیشـت کە بەکەلکـی هـیچ نەمـاوە , وە وتەکـانی ناپـاکی لە دەولـەتـدا بلاوکـردەوە لەگەل ئەمانەشـدا دەمزانی تلیاك خۆرە چەند ساڵ لەمەوبەر ) . پاش نیو کـاتژمیر ( مـارتن بورمـان ) وەڵامـی گۆرنگی هینـابوو بـۆ هتلر کە گۆرنـگ دەلیت : بەهۆی نەخۆشیەکەوە دەستی کیشـاوەتەوە لە هەمـوو پـلەو دەسـەڵاتەکانی . پـاش ئەوە بورمـان بە نـاوی هتلرەوە بروسکەیەکی ئاڕاستەی گۆرنـگ کـردوە کە بە خیانەتکـار تـاوانبارکراوە و داوای لیـدەکات خـۆی بە دەسـت بەسـەر بزانیـت و خـۆی و خیـزانەکەی و

ئەنـدامانی ناوەنـدی سـەرکردایەتیەکەی لە مالەکەیدا لە (برگهـوف) خـرانە ژێـر چـاودیریەوە لە ( بریخســتگادن ) . هەروەهــا هتلــر لە (وەســیەت ) نامەیەکــدا گۆرنـگ لە جینشینی خۆی دەخـات لە دوای خـۆی و ئەمیـرال ( دونتـز ) دادەنیت بە سەرۆکی دەولەت و سەرکردەی گشتی هیزی چەکدار بە پاشقول . هەروەك ( هملـر ) لەسـەرکار لا دەبـات بە بیـانوی هەوڵدان بـۆ وتـویژ لەگەل هاوپەیمانـان . هتلـر وتبـوی هەریەك لە گۆرنـگ و هملـر بە پەیوەنـدیە نهینـی یەکانیـان لەگەل هاوپەیمانــان بە مەبەســتی وتــویژ بەبــی ئاگــاداری و رەزامەنــدی مــن و بە هەوڵـدانیان بە گەیشـتن بە جـلەوی دەسـەڵات لەگەل خیانەتکارییـان بەرامـبەرم ســوکایەتیان هینــاوەتە ســەرخۆیان و تەواوی گەل ) . لە ئیــوارەی ( 30 ) ی ئەپریلدا هتلر لە ڕێگەی گوللەیەك خۆی دەکوژیت و پیش خۆی ژنەکەی ( ئیڤا براون ) بەهۆی خـواردنی ژەهرەوە خۆی دەکوژیت . ئیوارەی ( 1 ) ی مـایو ( مارتن بورما ن ) دەیویست دلنیا بیت لە جیبەجیکردنـی لەسیدارەدانی گۆرنـگ و بـۆ ئەم مەبەسـتە فەرمانیـدا بە پاسـەوانی رەش لەو روەوە بەلام سـەرکردەکانی پاسـەوان ئەنجامـدانی ئەو کارەیـان رەتکـردەوە و لە جیـاتی ئەوە پیشنیاریان کـرد کە ( کــولر ) گۆرنــگ ئــازاد بکــات . گــۆرنگیش هەوڵــی تەواوی دا کە دلــی پاسـەوانانی دەوروبەری نەرم بکـات بەوەی کە گـوێیە بە تەنهـا ئەو مـاوەتەوە لە نیـوان سـەرکردە بەرزەکـانی نـازی لە دوای خۆکوشتنی هتلـر و گـوبلز هەر ئەو دەتوانیت لەگەل ئەمریکیەکـان پیك بیت . پیـاوانی پاسـەوان بەم قسانەی گۆرنـگ قایل بـوون و دایـانە دەست یەکەمین پۆستەی پیـاوانی هیـزی ئاسمانی . لە ( 6 ) ی مایۆدا هەلدەستیت بە پەیوەنـدی کـردن بە ئەمیـرال ( دونتـز ) ەوە کە جینشـینی هتلر بوو پێی ڕاگەیاند زانیویتی جەنەرال ( گـودل ) نیردراوە بـۆ وتـویژ لەگەل ( ئایزنهـاوەر ) گۆرنـگ بە دونتزی ڕاگەیانـدبوو کە باشـترین کەسـە واتە گۆرنـگ خۆی بۆ وتویژ لەگەل ئـایز نهـاوەر بەو پێیەو کە پلـەی سـەربازی وەك پلـەی ئـایز نهاوەرە و لەگەل ئەوەشدا پیاوانی سیاسـەت و ڕاگەیانـدن لە بەریتانیـا و ئەمریکـا مـن واتە گۆرنـگ بە شیاوترین نـازی لەقەلەم دەدەن بەهۆی کەمـی توندڕەوەی و گونجانـدنەوە . بەلام دونتـز گرنگـی نەدا بە وەلامـدانەوەی و لە هەولەکـانی خۆی بەردەوام بـوو لە ( 29 ) ی ئەپریـل هیـزە ئەلمانیەکـان لە ئیتالیـا خۆیـان بە دەســتەوە دەدەن و لە ( 4 ) ی مــایۆدا هیــزە ئەلمانیەکــان لە بــاکور و رۆژئـاوای ( ئەفریقیـا ) خۆیـان دەدەن بەدەست مارشـال ( مـونتگمری ) یەوە لە (

7 ) ی مایودا تەواوی هیزە ئەلمانیەکان خۆیان دەدەن بەدەستەوە . بەڵام گۆرنگ سوربوو لەسەر پەیوەندیکردن بە ئایز نهاوەرەوە هەرچەندە ئەو جیگەیەی کە ( کولر ) بۆی دیاریکردبوو بۆ چاوپیکەوتن لەگەل ئەمریکیەکان بۆ ئەوەی خۆی بەدەستەوە بدات بخریتە ژیر چاودیریەوە بەلکو راستەوخۆ لەگەل ئەندامانی ناوەندی سەرکردایەتیەکەیدا خۆی بەدەست یەکەیەکی سەربازی ئەمریکیەوە بدات ئەوانیش زۆر بەگەرمی پیشوازیان لیکرد و دەیانخواست کە چەند وینەیەکی لەگەلدا بگرن کاتیك کە هەوالی خۆ بەدەستەوەدانی دەگات بە سەکردایەتی سوپای ئەمریکی داوا دەکریت کە تەنها وەك دیلیکی جەنگی ئاسای سەیری بکریت و هەلسوکەوتی لەگەل بکریت , نەوەك وەك کەسایەتی گرنگ . لە پاشان بە فرۆکەیەك دەگویزریتەوە بۆ بەندیخانەی ( ئۆجسبرگ ) ی تایبەت بە دیلەکانی جەنگ و لەم گوێستنەوەیەدا ئەلفیلد ماریشال ( بروشتش و روبرت کروب ) ی پیاوی پیشەسازی هاورییەتی دەکەن و لە پاش گەیشتنی بۆ بەندیخانە ئەفسەران لەوێ پیشوازی لیدەکەن و خوانی بۆ ئەنجام دەدەن و ریزی لی دەگرن . رۆژی ( 11 ) ی ئەگۆست پیاوانی ڕاگەیاندن چاوپیکەوتنیکی لەگەل ساز دەکەن و لە چاوپیکەوتنەکەدا گۆرنگ دەلیت : لەسەر هتلر پیویست بوو کە لە ساڵی 1994 دا خۆی بەدەستەوە بدات . لە (21 ) ی مایۆ 1945 دا گۆرنگ دەگویزریتەوە بۆ بەندیخانەی ( موندورف ) لە نزیك ( لوکسمبرگ ) کە بەدەستبەسەری مایەوە تاکو رۆژی پیشکەشکردنی بە دادگا .

بەشی شەشەم :

# دادگاییکردن

گۆرنگ و دوو جانتای پڕ لە ( پاراکۆدین ) کە جۆریکی خاوکراوەیە لە ( مۆرفین ) دەگەنە بەندیخانەی ( موندورف ) کۆلونیل (هندرسن ) کە ئەفسەریکی ئەمریکی بوو دەلیت : کاتیك کە گۆرنگ گەیشتە بەندیخانە وامزانی دەرمان فرۆشی گەرۆکە . لە پاشان هندرسن بیری لەوە کردەوە کە کە داوا لە پزیشکی تایبەتی بەندخانە بکات هەوڵبدات گۆرنگ لە تلیاك وەرگرتن دور بکەویتەوە هەرچەندە بۆ چەند مانگیك توشی ئازار دەبیت لە ماوەی چارەسەرکردندا . بەم جۆرە پاش دورکەوتنەوەی لە وەرگرتنی تلیاك گۆرنگ دەتوانیت بە تەواوی بە ئاگا بونەوەی لە دادگادا بوەستیت و بەرگری لە خۆی بکات کە مانگی نۆڤەمبەری بۆ دەستنیشانکراوە . لە ماوەی بەندیتیدا لە چاوەروانی دادگایی کردنیدا بەشیکی زۆر لە کیشی لەشی ون کردبوو ، زۆر چالاک بووبوەوە . بەندکراویکی نمونەی بوو دالْغەی تەنها لای مال و مندالەکەی بوو شایانی باسە کە ژنەکەیی و کچەکەشی بە دیل گیرابوون کاتیك ( سێر ئیفۆن لیبرکباتریك ) سەردانی دەکات دەبینیت زۆر ئاساییە و ورەشی بەرزە کباتریك بەریتانی بوو پیشتر گۆرنگی ناسیبوو لە پیش جەنگدا لە بەرلین . بەڵام رینتروب لە حالەتیکی ئالۆزی باری دەرونیدا بوو ، گۆرنگ هاوکاری تەواوی نوێندبوو لەگەل لیکۆلەران و پزیشکانی تایبەتی دەرونی دیلەکان . گۆرنگ ئاوی کۆلۆنیا و تۆزی واتە ( بۆدرە ) ی بەکاردەهینا لە پاش ریشتاشین و جل و بەرگی ژیرەوەی حەریر بوو هەروەها لەگەل خۆی گەورەترین سێ مستیلەی هینا بوو کە یەکیکیان یاقوتیکی گەورەی لەسەربوە و دووەم زومردیکی گرانبەها و سێ هەمیان ئەلماسیکی شینی لەسەر بووە لەگەل سێ کاتژمیری گرانبەهادا . گۆرنگ زۆر ئاسای مامەلەی لەگەل بارودۆخەکەدا دەکرد . چونکە تا ئەوکاتەی شانازی بەو پلەو پایانەوە دەکرد کە لە پیشوودا گرتبویە دەست و هەمیشە

دەیویست بە باشترین شێوە خۆی پیشان بدات بەو پێیەی کە گەورەترین سەرکردەی نازییە لە ژیاندا ماوە و بۆتە کەسێتییەکی مێژوویی لەکاتێکدا کە ئەو کەسانەی دادگایی دەکەن لە ئاستی ئەودا نین . گۆرنگ بە پزیشکەکەی ڕاگەیاندبوو کە پاش ( 50 ) یان ( 60 ) ساڵی تر پەیکەری هرمان گۆرنگ لە هەموو ئەلمانیادا بنیات دەنریت کاتیك کە کاتی دادگایی کردن نزیك دەبیتەوە گۆرنگ و هیس کە لە بەندیخانەی بەریتانیاوە هینرابوون بۆ بەندیخانەی ( نۆرمبرگ ) لەگەل رینترۆب و شاخت و فۆن باین . یەکیك لە بەندکراوەکان کە ( روبرت لی ) بوو توانی خۆی بکوژیت ئەم کارە بوە هۆی توندوتۆل کردنی چاودیری لەسەر باقی دیلەکان . لە پیش دادگایی (30) رۆژی فایلیك دەدریت بە گۆرنگ تیایدا ( 24 ) هەزار تاوانی تیا تۆمارکرابوو کە درابونە پاڵی و بە زمانی ئەلمانی نوسرابوو شایانی باسە ئەو تاوانانە بەپێی ئەو بەلگەنامانە دەستنیشانکرابوون کە ئەمریکیەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو لە بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتی پیشووی حکومەتی نازی لە کاتی جەنگەکاندا .

تاوانەکانی زۆر بوون بریتی بوو لە :-

1- گۆێ نەدان بە پەیماننامەکان و بەرپاکردنی جەنگی قورس و پیلان دانان بۆ دەست بەسەراگرتنی سەربەستی گەلان و خراپی هەلسوکەوت کردن لەگەل دانیشتوانی ولاتە داگیرکراوەکان و بەکار هینانی چەوساندنەوەی رەگەزی و ئاینی و گالتەجاڕی لەکار کردندا .

2- ئەنجامدانی تاوانی دژ بە ئاشتی لە ڕێگەی داگیرکردنەوە .

3- تاوانەکانی جەنگ کە لە دژی تاك و کۆمەل ئەنجام دراون .

4- تاوانەکانی دژ بە رۆڤایەتی .

بەندی سآ هەم و چوارەم قەلاچۆکردنی هەندێک رەگەز و دلڕەقی لە هەلسوکەوت کردن لەگەل گیراو دیلەکانی جەنگ و دانیشتوانی مەدەنی لە خاکە داگیرکراوەکاندا دەگریتەوە لەگەل چەوساندنەوەی کریکاران بە شیوەیەکی گالتەجاڕی و ترسناك و بەکارهینانی ئەشکەنجەدانی بآ بەزەیانەی گیراوەکان لەناو ئۆردوگاو گرتوخانەکاندا .

دادگایی دریژەی کیشا بۆ ( 218 ) رۆژ لە ( 20 ) ی نۆڤەمبەری 1945 تاوەکو ( 31 )ی ئەگوستی 1964 لە پاشان بە مانگیك لە ( 30 ) سبتەمبەر و ( 1 ) ی ئەکتۆبەر حوکمەکان دران .

ئینجا هەر دیلە و لیستیکی بە ناوی باشترین پاریزەرانی ئەلمانی خرایە بەردەست بۆ ئەوەی هەیئەتی بەرگری دەستنیشان بکەن . شایانی باسە کە تاوانباران لەلایەن هاوپەیمانانەوە بە کۆمەڵێك جەردە سەیر دەکران کە بەهۆی توندوتیژی و هیزەوە دەستیان گرتووە بەسەر دەسەڵاتدا و جەنگی قورسیان بەرپارکردوە لە دژی دراوسیکانیان هەستاون بە کوشتنی ملیۆنەها کەس بەهۆی جیاوازی رەگەزیان لە ناویان بردون بەم پێیە دادگاییەکە بووە بلندگۆیەکی جیهانی بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر نازیەت و دیکتاتۆریەت . شایانی باسە کە دادگای ( نورمبرگ ) یەکەمین دادگایی بوو لە دژی تاوانبارانی جەنگ و نازیەکان ، ئەو دادگایە تاوەکو ئەمرۆ بەردەوامە لە کارەکانیدا لە ئەلمانیادا . سەرۆکایەتی دادگا درایە دەست لۆرد ( لورانس ) ی بەریتانی نەژاد کە لە سەرەتای دەست پیکردنی دادگاییدا لە گۆرنگی پرسیبوو کە بە ( بەلێ یان نەخێر ) وەڵام بداتەوە کە ئایا تاوانبارە یان بێ تاوان گۆرنگیش وتبوی کە ( من خۆم بەبێتاوان دەزانم ) گۆرنگ ببوە جیی سەرنجی هەموان لە دادگادا . لە کاتەکانی حەوانەوەدا کاتیك کە دیلەکان دەگەڕانەوە بەندیخانە بۆ نانخواردن گۆرنگ دەیوت ( گویَ مەدەنێ خەلکی چی دلیت ئیستا ئەوە پەیوەندی بە منەوە نییە چونکە من دەزانم کە ئەوان لەڕابردودا چیان دەوت ئەوان چەپلەیان لی ئەدا و هاواریان دەکرد قایل بوون بە رەوتی ژیانیان ، من دەربارەی جەماوەر زۆر دەزانم ) . کاتیك ئەمرکیەکان درکیان بە کارێگەری گۆرنگ کرد لەسەر گیراوەکان لە کاتی نانخواردندا لەوان جیا دەکرایەوە . هەر بۆیە گۆرنگ وتبوی ( ئەمە هەمووی لەبەرئەوەیە کە من یەکەمین تاوانباری نازیم لە کۆمەلەکەدا . بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنیت کە ترسناك ترینیان بم , بەهەرحال پیویستە لەسەر بەریوبەری بەندیخانەکە چۆن هەلسوکەوت دەکات لەگەل کەسایەتییە گرنگە میژووییەکان گەر هەلەش بین یاخود راست ) . لە ( 8 ) ی ینایردا گۆرنگ بەبێدەنگی لە هۆلی داداگادا دادەنیشیت و گوییستی ئەو تاوانانە دەبیت کە درابوونە پالی و بڕیاری دادگا بە کەسایەتی ناوەندی بازنەی ئامادەباشی سەربازی ئەلمانی تاوانبار کرد هەر وەك بەشداری کردووە لە داگیرکردنی (

نەمسا و چیك سلۆفاكیا ) و ئامادە بووە بۆ داگیركردنی (پۆلەندە و روسیا ) و دزینی ئابوری ئەو وڵاتانە و بەكارهێنانی گالتەجاڕی بۆ ئەم مەبەستە بەڵگەنامەی پویست لەو رووەوە خرانە روو بە ئیمزای گۆرنگەوە بۆ سەلماندنی ئەم تاوانە هەروەها هەستانی بە دروستكردنی ئۆردوگا و گرتوخانە ، بەكارهینانیان بە شیوەیەكی ترسناك و لەسێدارەدانی یەهود و بەكارهینانی كریكارانی وڵاتانی داگیركراو بە شیوەیەكی گالتەجاڕی . هەروەها تاوانباركرا بە هاندان بۆ نەهیشتن و لەناو بردنی یەهود و بەپێی ئەو بەلگەنامەیەی كە بەئیمزای گۆرنگەوە دەستكەوت و بریتییە لە دەركردنی فرمانیك بۆ ( هیدرش ) بە دۆزینەوەی ریگا چارەیەك بۆ كێشەی یەهود . لە پاشان ریدرا بە گۆرنگ كە بەرگری لە خۆی بكات و لەگەل پاریزەرەكەی ( ئوتو شتاهمر ) بدویت ئەنجا مافی بەرگری لیكردنی لە ( 8 ) ی مارسدا دەستی پیكردوو ماوەی ( 15 ) رۆژی خایاند . پاریزەرەكەی دەیوت كە ئەو لە هەموو ئەو تاوانانەدا بەشداری نەكردووە زۆربەیان بەبێ ئاگاداری ئەو ئەنجامدراون بە تایبەت لەو ماوەیەدا كە لە هتلر دوور كەوتۆتەوە لە ساڵی 1943 دا بۆ سەلماندی ئەم راستیەش مارشال ( میلش ) و چەند كەسیكی تر وەك شاهید بانگكران و هەموو وتیان كە ئیمەش و گۆرنگیش ئاگاداری ئەو تاوانانە و لەسیدارەدانی یەهود نین ئەو كارە تەنها پیاوانی پاسەوانی رەش و ( هملر) لیی بەرپرسن و هیچ كەس بە گۆرنگیشەوە نەی دەتوانی دژی هتلر بوەستیت . بەڵام سیر ( ماكسویل فیف ) جیگری داواكاری گشتی بەریتانی توانی لە كاتی لیكۆلینەوە لەگەل مارشال ( كسلرنج ) راستی حاشا هەلنەگری دەست بكەویت سەبارەت بە ئاگاداری گۆرنگ لە هیرشە ئاسمانییەكانی سەر ( وارسۆ و روتردام ) كاتیك كە ( كسلرنج ) سەركردەی هیزی ئاسمانی ئەلمانیا بووە . لە پاشان گۆرنگ ( 13 ) ی مارس بەرگری لە خۆی دەكات و جەماوەریش بە تەوسەوە چاوەڕوانی ئەنجامی دادگان و گۆرنگ لە سەرەتای بەرگری كردن لە خۆی وەك ئەكتەریك كە پیشتر خۆی بۆ چونە سەر شانۆ ئامادە بكات وابوو پاش ئەوەی چەند مانگیكە چاوەڕوانی ئەو كاتەی دەكردوو دەیویست راستگۆ بیت لەو دەسەڵاتانەی كە هەیبوە لە حكومەتی نازیدا دەیزانی كە راستگۆیی سوودی هەیە لە سوكی بڕیاردان لە دادگاو لە هەمانكاتدا راكیشانی سۆزی هەندێک بەلای خۆیدا , بەڵام ئەو پرسیارانەی كە ئاڕاستەی كران بارودۆخەكەی گۆڕی بە جۆرك كە تەنها

لەوەدا راستگۆیی بنوینێ کە هاوکاری کردوە لە چەسپینی یاسای نازیدا بە شێوەیەکی گشتی سەرکردایەتی کردوە , هەروەك نەرمی پشانداوە لەو قەسابخانەیەی بە مەبەستی پاکسازی دوژمنانی حیزب ئەنجامدرا کە تیایدا ( رۆهم ) و زۆری تر لە ناوبران پیش وەخت کۆتایی هیناوە بەو کارە هەروەها بەرپرسیتی خۆی لە بەشداری کردنی لەسیدارەدانی دوژمنانی هتلریدا دەوری یاسا پیشاندان هەروەها بەرپرسیتی خۆی پیشاندا لە دەرکردنی یاساکانی ( نۆرمبرگ ) بەڵام رایگەیاند کە ئەو یاسایانە تەنها لەبەرئەوە دەرکرابوو کە ریژەی یەهود لە هیز و سامان و رەگەزدا لەسەرو ئەلمانەوە بوو . هەروەها شانازی بەوە دەکرد کە پرۆگرامی چەکسازی لە ئەلمانیای پیدرابوو لەگەل زیندوکردنەوەی هیزی ئاسمانی ئەلمانیا و وەرگرتنی سەرۆکایەتی ئابوری ، کاتیك کە دەگەڕایەوە بەندیخانە لەگەل پزیشکەکەی دەدوا و پێی دەوت : ( ئیستا چۆنم ، رات چی یە لەو بڕوایەدا نیم کە ترسنۆك هاتبمە بەرچاو لە هۆلی دادگادا هەرچەندە هەستم بە شلەژانیکی زۆر دەکرد لەم پیناوەدا پشتم بە بیرکردنەوە دەبەست ئەزانی ئەو وشانە زۆر کەمبوون کە تۆ ئامۆژگاریت کردم لە کاتی بەرگری کردندا بیانکەم ) . پاش ئەوەی گۆرنگ لەبەرگری کردنی خۆی دەبیتەوە توشی لیکۆلینەوەیەکی گران دەبیت لەلایەن داواکاری گشتی بەریتانی روسییەوە و شاهیدی ( شاخت و شبیر ) دژی و لە پاشان پاریزەرەکەی دوا بەرگری لە گۆرنگ دەکات و دەلیت : ( گۆرنگ هەوڵیداوە جەنگ بەرپا نەبیت و ئەو بەرپرس نییە لە سیاسەتی دوژمنکارانەی هتلر و هەلنەساوە بە دەست بەسەراگرتنی تابلۆ هونەرییەکان ، بە ناوی دەولەتەوە نەبیت و بەشداری نەکردوە لەو کارانەی کە لە ئۆردوگا و گرتوخانەکاندا ئەنجامدراون ، بەلکو نەگبەتی لەوەدا بووە کە دلسۆز بووە بەرامبەر بە هتلر ) . ئینجا داواکاری گشتی دیتە قسەو دەلیت : ژیانی گۆرنگ دوو بەش بووە بەشی یەکەمیان سەربازی بەشەکەی تری وەك پیاوانی ( کاوبۆی ) وابووە و پەنجەی گەورەی کردووە بە هەموو خواردنیکدا بەشداری کردووە لە لە سیدارەدانی بەرهەلستکاران و بوختانو تاوان خستنە پاڵ سەرکردە سەربازییەکان بە مەبەستی رزگاربون لە دەستیان بە هاوکاری لەگەل هتلر . لە پاشان داواکاری گشتی بەریتانی ( سیر هارولد شوکرس ) باسیکی دورودریژی باس کردو تیشکی خستە سەر ئەو تاوان و بەلگانەی کە تاوان دەسەلمینن و وتبوی کە ( گۆرنگ زانیاری و ئاگاداری لە

کارەکاندا لە هتلر زیاتر بووە ، لە هتلەر کارێگەری زیاتر بووە لە ریکخستنی دەولەتدا لە پیناو بەرپاکردنی جەنگی دوژمنکارانە چونکە جەنگاوەران سنوری وڵاتان ناشکینن و بە بۆمبو تەقە کردن و بنیادنانی ژوری تایبەت بە ژەهراوی کردن بە گاز خەلکی بکوژن و لەناویان بەرن لەو روەوە فرمانیان پینەکریت ) .
ئینجا ڵا دەکات بەلای گۆرنگداو دەلیت : ( لەسەرەتای دادگاییەکەدا تاوانبارم کردی و پیم ڕاگەیاندیت کە رۆژیك دیت پیاو پیویستە دەستنیشان بکات لە نیوان ویژدانی و جێبەجێ کردنی داواکاریەکانی سەرۆکەکەی بەڵام تۆ و هەموو ئەو تاوانبارانەی تریش هەموو دەستبەرداری ویژدانتان بوون ) لەپیناو گویڕایەلی ئەو دڕندەیەی کە دروستتان کردبوو بۆیە ئیستا ناتوانم حاشا لە بەشداربوون و بەرپرسیاریتیتان بکەن لەو تاوانانەی کە ئەو دڕندەیە ئەنجامیداوە . شایانی باسە گۆرنگ یەکەمین تاوانبار بوو کە بانگکرا بۆ ئەوەی گوێبیستی بریاری کۆتای دادگا بیت لەو کاتەدا ئامیری گوێبیستنەکەی تیکدەچیت کە لە هەردوو گویچکەیدا بوو هەربۆیە سەۆرکی دادگا چاوەڕوان بوو تاکو ئامیرەکە چارەسەرکراو لە پاشاندا دوا بڕیاری خۆیدا بەسەر گۆرنگداو وتی : ( هرمان گۆرنگ ) بەپێی ئەو تاوانانەی دراونەتە پاڵت دادگای نیونەتەوەی سەربازی بڕیاریدا بە کوشتنت بە لەسیدارەدان ) شایەنی باسە کە گۆرنگ بە پیوە رادەوەستیت کاتی بیستنی دوا بریاری دادگاو هۆلی دادگا چاوەڕوانی بەرپەرچدانەوە بوون لەلایەن گۆرنگەوە بەڵام گۆرنگ ئامیرەکەی لە گویی کردەوە و یەکڕاست بە بیدەنگی هۆلی دادگای جیهیشت . لە مارسی 1946 دا ژن و کچەکەی لەگەل خیزانی باقی گیراوەکان ئازاد دەکرین و ژنەکەی و کچەکەی سەردانی دەکەن کە گۆرنگ بەبینینی کچەکەی زۆر نیگەران دەبیت لە پاشان جاریکی تر لە پاش بڕیاردانی لە سیدارەدران ژنەکەی سەردانی ئەکاتەوە گۆرنگ داوا دەکات کە وەك سەربازیك گوللە باران بکریت بەڵام ئەو داوایەی رەتکرایەوە چونکە ئەو بە جۆریك ئەو بڕیارەی بەسەرا دراوە لەبەرئەوەی ئەو وەك سەرباز هەلسوکەوتی نەکردوە . ئەنجا گۆرنگ بڕیاری خۆکوشتن دەدات لە شەوی ( 15 ) ی ئەکتۆبەری 1946 دا پیش نیوەی شەو بە دوو کاتژمیر بەر لە جیبەجی کردنی بریاری دادگا . ئنجا ئەو (کەپسولە ) سیانیدە دەخوات کە لە ناو دەمیدا شاردبویەوە هەرچەندە پزیشك بانگکرا بۆ فریاکەوتنی بەڵام کات دڕەنگ بوو ئەو مردبوو لە پاش ئەو ( رینتروب ) بڕیاری دادگای

بەسەرداجێبەجێ کراو لەسیدارەدرا لە پاشان لاشە کانیان لەگەل لاشەی گۆرنگ دەسوتێنرین و خولەمیشەکانیان لە هەوادا بلاوکرایەوە بۆ ئەوەی گۆڕیان نەبیت لەپاش مردنی گۆرنگ نوسراویك دۆزرابۆوە کە لەلایەن گۆرنگەوە نیردرابوو بۆ بەریوەبەری بەندیخانەو تیایدا هاتبوو ( بۆ بەریوەبەری بەندیخانە . من هەمیشە ( کەپسول ) ی ژەهرم لەگەل خۆم هەلدەگرت لە کاتی دەستگیرکردنمەوە . کاتیك چوومە بەندیخانەی ( موندورف ) سێ دانەم پیبوو . یەکەمیانم لە جل و بەرگەکانم شاردمەوە بۆ ئەوەی گەر پشکنین ئەنجامدرا بدۆزریتەوە و دووەمیش لە ژیر ( عەلاگە ) ی جلەکانمدا بوو کاتیك کە جلەکانم دەگۆڕی لەویم دادەناو کەخۆم دەگۆڕی دووبارە جارێکیتر هەلم دەگرتەوە و لەکاتی دانیشتنەکانی دادگادا یاخود لە پیلاوەکانمدا یان لە هەرجیگایەکی لەشمدا دەمشاردەوە سێ هەم دانەش ئەوەتا لە قوتوی کرێمی دەم وچاوەکەدا , پیویست نییە کە ئەو کەسانە تاوانبار بکرین ئەرکی پشکنیان ئەنجامدەدا چونکە بە ڕێکەوت نەبوایە نەدەدۆزرانەوە . لەبەرئەوەش بریارمدا کە خۆم بکوژم پاش ئەوەی لەلاین پزیشك ( جلبرت ) ە تەوە پیم ڕاگەیەندرا کە داواکەم سەبارەت بە گوللە باران کردنم لە جیاتی لەسێدارەدانم ڕەتکراوەتەوە .

( ئیمزا هێرمان وێلهێڵم گۆرنگ )

